# کتێبی وەڵامەکانم



## بۆ باوەڕدار و بێ باوەڕان





پڕۆفرۆشترین کتێبی دکتۆر زاکیر نایک

# کتێبی وەڵامەکانم

## بۆ باوەڕدار و بێباوەڕان




نوسینی: دکتۆر زاکیر نایك

وەرگێڕانی: مامۆستا دیار ئەسعەد

پیاداچونەوەی: مامۆستا ئارام عەلی مەجید

زمانەوانی: هیوا عەبدولڕەحمان



07701918565 - 07501571818

چاپ و بڵاوكردنەوە

ناوی كتێب: كتێبی وەڵامەكانم

نوسینی: دكتۆر زاكیر نایك

وەرگێڕانی: مامۆستا دیار ئەسعەد

پیاداچونەوەی: مامۆستا ئارام عەلی مەجید

زمانەوانی: هیوا عەبدولڕەحمان

تیراژ: ١٠٠٠

چاپ و بڵاوكردنەوە: كۆمپانیای كتێب



**تێبینی: وەرگێڕانی دەقی قورئانەكانم لە تەفسیری (ڕەوان)ەوە وەرگرتووە كە لە وەرگێڕانی زانا و بانگخوازی كورد مامۆستا ئەحمەد كاكە مەحمودە، بە سوپاس و پێزانینم بۆ مامۆستا ئەحمەد كاكە مەحمود و كتێبخانەی مەحوی لە هەولێر كە چاپی تەفسیری ڕەوانی كردووە.**

# ژیان و بەسەرهاتی دکتۆر زاکیر نایك





دکتۆر زاکیر نایک لە تەمەنی لاویتیدا



عەبدولکەریم نایک باوکی دکتۆر زاکیر نایک

زاكیر عەبدولكەریم نایك لە (١٨)ی ئۆكتۆبەری ساڵی **(١٩٦٥ز) لە**دایكبووە، بانگخوازێكی ئیسلامیی هیندییە و، سەرۆكی (دامەزراوەی لێكۆڵینەوەی ئیسلامییە)، هەروەها دامەزرێنەری (Peace TV)ە كە نزیكەی (١٠٠ ملیۆن) بینەری هەیە و، بە خاوەنی بیرۆكەی ئاینی بەراورد و، كاریگەرترین بیرمەندی سەلەفی لە هیندستان و، ئەستێرەیەكی دیاری بانگەشەی ئیسلامی مۆدێرن و، بە ڕابەرێكی سەلەفی جیهانی دەزانرێت، جیاواز لە زۆرینەی بانگخوازانی تری ئیسلامی وانەكانی بە زمانی باو بە زمانی ئینگلیزی پێشكەش دەكات نەك ئۆردو، چاكەت و پانتۆڵ دەپۆشێت وەك بە پۆشینی جلوبەرگی نەریتی.
پێش ئەوەی ببێت بە وتاربێژێكی ناودار؛ وەك پزیشكێك كاری كردووە، چەندین وتار و وانەی لە چەند نامیلكەیەكدا بڵاوكردۆتەوە؛ سەبارەت بە ئایینی ئیسلام و ئایینی هیندۆس، لەگەڵ ئەوەی كە بە شێوەیەكی گشتی خۆی لە دەمارگیری دزیوەتەوە، بەڵام لەلایەن هەندێك لە لێكۆڵەرەوەی بیرمەندی سەلەفییەوە و هەندێك ئیسلامی ڕادیكاڵەوە بە بانگەشەكەری بیری وەهابی دادەنرێت، ئێستا ئامۆژگاری و وانەكانی لە هیندستان و كەنەدا و بەریتانیا و بەنگلادیش قەدەغەكراوە، ئەو پێی وایە كە ڕەخنەگریی لە كۆمەڵگای ئیسلامی زیاترە وەك لەوانەی كە لە كۆمەڵگای ئیسلامیدا نین.
زاكیر نایك لە مۆمبای مەهارا شكرای وڵاتی هیندستان لەدایكبووە، زانستی پزیشكی لە كۆلێژی پزیشكی تۆپی والا و، نەخۆشخانەی خێرخوازی نایر خوێندووە و، دواتر چووەتە زانكۆی مۆمبای لەوێ بڕوانامەی پزیشكی و نەشتەرگەری بەدەستهێناوە، لە ساڵی **(١٩٩١ز)دا** دەستی كردووە بە كاركردن لە بواری بانگخوازیی و، دامـەزراوەی لێكۆڵینەوەی ئیسلامی

دامەزراند، هاوسەری زاکیر نایك کە ناوی (فەرحەت نایك) لە کەرتی ئافرەتانی دامەزراوەکەدا کاردەکات، لەساڵی (٢٠٠٦ز) نایك ئاماژەی بەوە کرد کە سروشتی لە ئەحمەد دیدات وەرگرتووە؛ کە بانگخوازێکی ئیسلامییە لە ساڵی (١٩٨٧ز) چاوی پێی کەوتووە (هەندێك جار زاکیر نایك بە دیدات پلەس دەناسرێت لەلایەن ئەحمەد دیداتەوە).

نایك خوێندنگای ئیسلامی نێودەوڵەتی لە مۆمبای و، دەزگای هاوکاری ئیسلامی یەکگرتووی دامەزراندووە؛ کە هاوکاری پێشکەش بە خەڵکانی هەژار و گەنجانی موسوڵمان دەکات، وێب سایتی دامەزراوەی لێکۆڵینەوەی ئیسلامی وەسفی زاکیر نایك دەکات وەکو بیرۆکە و وەگەڕخەری تۆڕی تەلەفزیۆنی **(Peace TV)**، ئەم کەناڵەی نایك بانگەشەی ڕاستگۆی، یەکسانی، ئەخلاقیبوون، سازان و دڵسۆزی دەکات بۆ تەواوی مرۆڤایەتی، لەساڵی (٢٠١٦ز) لە کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەوانیدا زاکیر نایك ڕایگەیاند کە ئێستا دانیشتووی هیندستان نییە.

# وتار و دیبەیتەکانی دکتۆر زاکیر نایك




**دکتۆر زاکیر نایک و فەریق نایکی کوڕی**

نایك چەندین وتار و دیبەیتی ئەنجام داوە دەوترێت لە تەواوی جیهاندا لەنێوان (٢ تا ٤ هەزار) وتاری پێشکەش کردووە، مرۆڤناس تۆماس بلۆم هانسن لە نووسینێکدا ئاماژەی بەوەکردووە کە شێوازی نایك لەلەبەرکردنی قورئان و فەرمووده بە زمانی جیاواز وایکردووە کە لە ناوەندی موسوڵمانەکاندا کەسێکی زۆر ناودار بێت، زۆرێك لە دیبەیتەکانی تۆمارکراون و بەشێوەیەکی بەرفراوان لەسەر (DVD) و لەئینتەرنێتدا بڵاوبووەتەوە. لە تەلەفزیۆنی (Peace TV) کە خۆی سەرپەرشتی دەکات پەخش دەکرێت، ئەو بابەتانەی کە زۆر قسەی لەسەر دەکات بریتین

له: «ئیسلام و زانستی سەردەم» و «ئیسلام و مەسیحییەت» و» ئیسلام و عەلمانییەت».

یەکەم دیبەیتی نایك دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٩٤ز) لەسەر ڕووناکی کتێبێك بە ناونیشانی: « ئایا بنچینەکانی ئایینی دەبنە کۆسپ لەبەردەم ئازادی دەربڕین؟» لە نووسینی تەلیسما نەسرین بە ئامادەبوونی چوار ڕۆژنامەنووس دیبەیتەکە کە نزیکەی چوار کاتژمێری خایاند و، لە مانگی چواری ساڵی (٢٠٠٠ز) دا بە ناونیشانی: «قورئان و ئینجیل لە ژێر ڕۆشنایی زانستدا» دیبەیتێکی لەگەڵ ولیام کامپێڵ لە شیکاگۆ ئەنجامدا، کە یەکێکە لە دیارترین دیبەیتەکانی و، لە ساڵی (٢٠٠٦ز) «نایك» بەشداریکردووە لە گفتووگۆیەکدا لەگەڵ «سری سری ڕاڤی شانکار» لە «بەنگالۆر» لەسەر چەمکی: (خوا لە ئایینی ئیسلام و ئایینی هیندۆسدا)، هەموو ساڵێك لە ساڵی (٢٠٠٧ز)ەوە «نایك» ڕابەرایەتی کۆنفڕاسنی (دە ڕۆژەی ئاشتی) کردووە لە مۆمبای بەبەشداریکردنی (٢٠) بانگخوازی تری ئیسلامی.

## * ئوستراليا (٢٠٠٤ز) و وێڵز (٢٠٠٦ز)

لە ساڵی (٢٠٠٤ز) لەسەر بانگهێشتی تۆڕی زانیاری و خزمەتگوزاری ئیسلامی لە ئوستراليا لە «زانکۆی میلبۆرن» «نایك» لە وتوێژێکدا ڕایگەیاند کە تەنها ئایینی ئیسلام بە ڕاستی و بەیەکسانی مافی ئافرەتانی داوە و، جل و بەرگی ئافرەتانی ڕۆژئاوایی وا دەکات ئافرەتان زیاتر ڕووبەڕووی دەستدرێژی سێکسی ببنەوە، ئەم قسەیەی نایك ڕەخنەی توندی بە دوای خۆیدا هێنا؛ بەوەی کە نایك ئەخلاقی ئیسلامی بەرزتر داناوە و گاڵتەی بە بیرباوەڕەکانی تر و، ڕۆژئاوا بە گشتی کردووە و، قسەکانی نایك ڕوحی

جیاکاری پەروەردە دەکات و ڕق و کینە دووبارە دەکاتەوە.

لە ساڵی (٢٠٠٦ز) «نایك» سەردانی کۆنفرانسێکی کرد لە «کاردن» کە مشتومڕێکی زۆر بە دوای خۆیدا هێنا، کاتێك «دەیڤید دەیڤسی» ئەندام پەرلەمانی وێڵز داوایکرد کۆنفرانسەکە ئەنجام نەدرێت، ئەو پێی وابوو کە تێڕوانینەکانی «نایك» شایستەی ئەوە نین کە لە پلاتفۆڕمێکی گشتیدا بخرێتەڕوو. موسوڵمانەکانی «کاردن»یش پشتگیرییان لە «نایك» کرد تاکو لە شارەکەدا مافی قسەکردنی هەبێت. «سەلیم کیدوا»ی سکرتێری گشتی موسوڵمانانی وێڵز ناڕازی بوو بە بڕیارەکەی «دەیڤس» بە ناڕەوایزانی و وتی: «ئەو خەڵکانەی کە نایك دەناسن دەزانن کە نایك یەکێکە لەوانەی سەبارەت بە هاوشێوەی لەنێوان ئاینەکان قسە دەکات و، شێوازی کارکردن بۆ دروستکردنی فەزایەك لەنێوانیاندا ڕوون دەکاتەوە» و، «دیيڤد»یش بانگهێشت کرا بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی تایبەتی قسە لەگەڵ «نایك»دا بکات، کۆنفرانسەکە دەستی پێکرد.

## * ڕێگەگرتن لە چوونە ناو خاکی ئەمریکا و کەنەدا لە (٢٠١٠ ز)

ڕێگری لە «نایك» کرا بۆ چوونە ناو خاکی ئەمریکا و کەنەدا لە ساڵی (٢٠١٠ز)، هۆکاری ڕێگریکردنی لە چوونە ناو خاکی کەنەدا دوای نووسینی: (تأريخ الفتح) بوو، لە هەمان کاتدا ڕێی پێ نەدرا بچێتە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەلایەن وەزیری ناوخۆوە دوای پێشکەشکردنی چەند وتارێك لە لەندەن، وەزیری ناوخۆی ئەمریکا ئاماژەی بە بڕیاری دوورخستنەوەی نایك کرد بەوەی کە چەندین قسە کراوە لەلایەن «نایك»ەوە کە بەڵگەن لەسەر

ئەوەی نەهێڵم بێتە ئەمەریکا، نایك لەبەرامبەردا ئەم بڕیارەی بە بڕیاری سیاسی لەقەڵەمدا، نەك بڕیارێکی یاسایی بێت و، پارێزەرەکەی ئاماژەی بەوە کرد کە ئەو بڕیارە بڕیارێکی نامرۆڤانەیە و، ئەو وتانەی «نایك» کە هۆکاربوون بۆ ڕێگەگرتن لێی بێ بنەما و بێ ناوەڕۆکن.

## * گامبیا (٢٠١٤ز)

دوای ئەوەی لەلایەن سەرۆکی گامبیا «یەحیا جەمیع»ەوە بانگهێشتکرا، «نایك» لە ساڵی (٢٠١٤ز) سەردانی گامبیای کرد، کە هاوکات بوو لەگەڵ یادی (٢٠ ساڵ)ەی شۆڕشی گامبیا و، لە نێوان ڕۆژەکانی (١١-٢٢ی ئۆکتۆبەر) چوار وتاری پێشکەشکرد، وتارەکان لە «زانکۆی گامبیا» و «هۆتێلی پەنچەمی» و «ماڵی سەرۆك» و «هۆتێلی فۆنی کانسالا» و «کایریبا» و «کۆلۆلی» پێشکەشکرا و، ئەنجومەنی وەزیران و ڕابەرانی ئایینی و خوێندکاران و هەزاران کەسی دیکە ئامادەی ئەو وتارانەی «نایك» بوون، لەسەر بابەتەکانی وەکو (تیرۆریزم و جیهاد) و، (ئایین و لەبەرچاوگرتنی ماف)، (دەعوە یاخود وێرانکاری؟)، (تێنەگەیشتن لە ئایینی ئیسلام) و، هەروەها کۆنفڕانسێکی ئیسلامی لەگەڵ پێشەواکانی گامبیا ئەنجامدا.

## * مالیزیا (٢٠١٢ز) و (٢٠١٦ز)

«نایك» لە ساڵی (٢٠١٢ز) و، لەسەردانێکیدا بۆ وڵاتی مالیزیا چوار وتاری پێشکەشکرد، وتارەکانی لە زانکۆی تەکنەلۆجیا، مارا و، سەنتەری بازرگانی جیهانی کوانتەن و، پوترا لە کوالا لامپور پێشکەش کران، سەرۆك وەزیرانی پێشووی مالیزیا و، کەسایەتییە دیارەکانی مالیزیا و، هەزاران کەس ئامادەی

وتارەکانی بوون، سەرباری هەبوونی چەند نارەزاییەك لەلایەن ئەندامانی (HINDRAF)، ڕێکخەری وتارەکانی «نایك» ئاماژەی بەوە کرد کە وتەکانی نایك بۆ دروستکردنی سازان و گونجانە لەنێوان ئایینە جاوازەکان و، لە ساڵی (٢٠١٦ز) «نایك» شەش وتاری تری لە وڵاتی مالیزیا پێشکەشکرد بە ناونیشانەکانی: (لێکچووەکان لەنێوان ئایینی هیندۆس و ئیسلام)، (ئایا قورئان قسەی خوایە؟).

## * تێڕوانینەکانی

«نایك» ئاماژە بەوەدەکات کە ئامانجی بریتییە لە: (جەختکردنەوە لەسەر پەروەردەکردنی گەنجانی موسوڵمان کە هەست بە کەمی دەکەن سەبارەت بە ئاینەکەیان؛ وا هەست دەکەن کە ئایینەکەیان بەسەرچووە)، ئەو بە ئەرکی هەموو موسوڵمانێکی دەزانێت کە ئەو هەڵە تێگەیشتنانە لابەرین کە نەوەی نوێ سەبارەت بە ئایینی ئیسلام هەیانە، لە دوای ڕووداوەکەی یانزەی سێپتەمبەری (٢٠٠١ز)ەوە سەرباری هەبوونی ئەو هەموو دژایەتییە بەرامبەر بە ئیسلام، بەڵام لە ئەمەریکا (٣٤٠٠٠) کەس بڕوایان بە ئاینی ئیسلام هێناوە، لە ماوەی نێوان ١١ سێپتەمبەر بۆ مانگی تەممووزی (٢٠٠٢ز) دا، بە گوێرەی «نایك» ئاینی ئیسلام ئایینی ئەقڵ و مەنتیقە و، قورئانیش ١٠٠٠ ئایەتی تێدایە کە پەیوەستە بە زانستەوە.

## * زاڵبوونی ئیسلامی

«زاکیر نایك» ئەوە ڕادەگەیەنێت کە ئیسلام باشترین ئاینە، چونکە قورئان ئاماژە بەوە دەکات کە هیچ دەق و کتێبێکی پیرۆز ڕاست نین جگە لە قورئان

و، ئیسلام ئاینی لێبووردنە، بەڵام لە بەرامبەر گەندەڵی و نادادپەروەری و مادده کحولییەکان و هەموو خراپەکارییەکان، ئیسلام توندترین ئایینە، چونکە بەهاکانی مرۆڤایەتی باڵاترن.

## * میوزیک

«نایك» میوزیك و مادده کحولییەکانی هاوتا کردووە بەوەی هەردووکیان مەستکەرن و، بەوە ناسراوەتەوە کە سەماکردن و گۆرانی وتنی لاپەسەند نییە، چونکە ئایینی ئیسلام قەدەغەی کردووە.

## * سزای دزیکردن

«زاکیر نایك» پێی وایە کە هەرکەسێك تاوانبار بێت دەبێت سزا بدرێت، ئەو بڕینی دەستی پێ باشە وەك سزایەك بۆ دزیکردن، هەروەها ئامۆژگاری ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای کرد بۆ جێبەجێکردنی بڕیاری دەست بڕین بۆ کەمکردنەوەی ئاستی تاوان لەو وڵاتەدا.

## * مافەکانی ئافرەت

«نایك» بەوە ناسراوە کە پشتگیری لە لێدان لە هاوسەرەکان دەکات بە (ڕووخۆشی)، ئەو ئاماژە بەوە دەکات کە تا ئەو کاتەی کە خێزانەکان پەیوەست بن بەیەکەوە پیاو سەرۆکی خێزانە، بۆیە ئەو مافەی هەیە کە بە نەرمی لە هاوسەرەکەی بدات، هەروەها ئاماژەش بەوە دەکات کە موسوڵمانەکان مافی ئەوەیان هەیە سێکس لەگەڵ کۆیلە مێینەکانیاندا بکەن، «نایك» مەبەستی لە کۆیلە ئەو کەسانەیە کە لە شەڕدا بە دیل

دەگیرێن.

## * هاوڕەگەزبازی

«نایك» دیدێکی توندی هەیە سەبارەت بە هاوڕەگەزبازی، «نایك» ئەو کەسانە بەو نەخۆشانە لە قەڵەم دەدات کە بەدەست کێشەی مێشکەوە دەناڵێنن، چونکە ئەوان تەماشای فیلمە سێکسییەکان دەکەن و، دەبێت کەناڵەکانی ئەو فیلمانە لۆمە بکرێن و، سزای مردن بۆ ئەو کەسانە بە ڕەوا دەزانێت کە هاوڕەگەزبازن.

## * گەشەی بایۆلۆجی

زاکیر «نایك» وا بیردەکاتەوە کە بیردۆزی گەشەی چارلس داروین؛ تەنها وادانانێکی زانستییە و نەسەلمێنراوە، «نایك» ئاماژە بەوە دەکات کە بیردۆزە زانستییەکان تەنها وادانانن بە گوێرەی قورئان، بۆ نموونە چەند ئایەتێکی قورئانی هەن کە باس لە گەشەی کۆرپەلە دەکەن، هەروەها «نایك» دەڵێت:» ئەوەی داروین وتویەتی تەنها بیردۆزێك بووە، هیچ کتێبێك نییە کە بڵێ (ڕاستییەکانی گەشەسەندن) .هەموو ئەوەی کە هەیە تەنها بیردۆزی گەشەسەندنە و، هیچ دەقێك لە قورئاندا نییە کە زانست سەلماندبێتی کە ڕاست نییە، وادانانی زانستی و بیردۆزەکان لە دژی قورئانن، هیچ دەقێکی قورئان نییە کە لەگەڵ زانستدا یەك نەگرێتەوە.

### * ڕەخنەگرتن لە ڕاگەیاندن

«زاکیر نایك» بەوشێوەیە پێناسەی میدیا دەکات کە گرنگترین و ترسناکترین

چەکە لە جیهاندا، بەشێوەیەك دەتوانێت سپی بکات بە ڕەش و لاواز بکات بە پاڵەوان، دەبێت ئێمە ڕاگەیاندن بەشێوەیەك بەکاربهێنین بۆ لابردنی هەڵە تێگەیشتن و هەڵە لێکدانەوە و هەڵە وتن بە ناوی ئیسلامەوە، هەروەها «نایك» بیروڕای وایە کە هێز و میدیای ڕۆژئاوایی موسوڵمانەکان بە توندڕەو ناودەبەن بۆ ناشیرینکردنی ئایینی ئیسلام و، زۆرترین کار لە ناشیرینکردنی ئیسلامدا لەلایەن میدیای جیهانییەوە دەکرێت، کە ڕۆژانە لە هەوڵی شێواندنی شێوە و وێنەی ئیسلامیدان لە ڕێگەی چاپ و بڵاوکراوە و ڤیدیۆ و دەنگ و هێڵی ئینتەرنێتەوە و، مەبەستیان هەوڵدانە بۆ وەرگرتنی دەق لە قورئان و سوننە و ئەنجامدانی لێکدانەوەی هەڵە بۆی، هەروەها «نایك» ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەگەر ئافرەتێکی موسوڵمان حیجاب بپۆشێت ئەوا ڕووبەڕووی ڕەخنە دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر خۆی نەپۆشی ئەوا وەکو هێمایەك بۆ ڕێز و پێشکەوتن تەماشای دەکەن، یاخود ئەگەر پیاوێکی تەمەن (٥٠ ساڵ) کچێکی تەمەن (١٦ ساڵ) بکات بە هاوسەری خۆی؛ ئەوا لە هەواڵەکانی قەبەی دەکەن و گفتوگۆیەکی زۆری لەگەڵ دەکەن، بەڵام ئەگەر پیاوێکی تەمەن (٥٠ ساڵ) کچێکی تەمەن (١٦ ساڵ) لاقە بکات ئەوا وەکو شتێکی بێ بایەخ و بچووك لە ڕاگەیاندنەکانەوە باسدەکرێت.

## * لادان لە دین

«نایك» پێی وایە ئەو کەسانەی کە دەستبەرداری دینی ئیسلام دەبن پێویست نییە کە سزای مردنیان بەسەردا بسەپێنرێت، بەڵام لە ژێر سایەی یاسای ئیسلامدا ئەگەر کەسێك واز لە ئایینی ئیسلام بهێنێت و، دواتر بانگەشە

بکات لە دژی ئیسلام ئەوا دەبێت بکوژرێت، «نایك» سوپاسی ئەو وڵاتانە دەکات کە ڕێگە دەدەن بە موسوڵمانەکان بە ئازادانە بانگەشە بۆ ئایینی ئیسلام بکەن و، لە هەمان کاتدا پێی وایە بانگەشەکردن بۆ ئایینەکانی تر لە دەوڵەتی ئیسلامیدا دەبێت قەدەغە بکرێت، چونکە بیر و باوەڕەکانیان هەڵەن و، نابێت ڕێگە بدەین کە کەنیسە و پەرستگا لە وڵاتی ئیسلامیدا دروست بکەن؛ لە کاتێکدا ئایینەکەیان و پەرستنەکەشیان هەڵەیە.

## * جیهاد

لەمیانی ئەو وتارەی کە لە زانکۆی گامبیا پێشکەشی کرد «زاکیر نایك» بە توندی ئاماژەی بەوەکرد کە لە سەرتاسەری جیهاندا توندوتیژی زۆر ئەنجام دەدرێت بە ناوی جیهادەوە؛ کە تیایدا کەسانی بێ تاوان ژیانیان لە دەستداوە، «نایك» وا بیردەکاتەوە کە جیهاد لەلایەن موسوڵمانەکان و ناموسوڵمانەکانیشەوە لێکدانەوەی هەڵەی بۆ ئەنجامدراوە، جیهاد بە مانای هەوڵدان دێت بۆ باشترکردنی کۆمەڵگا، باشترین شێوازی جیهاد بریتییە لە مانەوە و وەستان لە دژی ناموسوڵمانەکان، بەبەکارهێنانی وانەکانی قورئان بۆ پێغەمبەر (د.خ)، چونکە کوشتنی کەسی بێ تاوان چ موسوڵمان بێت، یاخود ناموسوڵمان، ڕێگە پێنەدراوە لە ئایینی ئیسلامدا، لەگەڵ ئەوەشدا ڕاگەیاندن و میدیای ڕۆژئاوا بە تاوانبار دەزانێت لەبەرامبەر ئەوەی کە موسوڵمان بە توندڕەو لە قەڵەم دەدەن.

لەمیانی وتارێکیشیدا کە لە دوبەی پێشکەشی کرد «نایك» ئاماژەی بەوە کرد جیهاد وشەیەکە کە لەلایەن ناموسوڵمانەکان و تەنانەت هەندێك لە موسوڵمانەکانیش بەهەڵە لێکدراوەتەوە و، سەرەتا لەلایەن خاچ

پەرستەکانەوە ئەنجامدراوە، کە ملیۆنان کەسیان کوشت لە ژێر ناوی مەسیحییەتدا، جیهاد بەڕاست بە مانای ئەوە دێت کە بجەنگێت لە دژی خراپەکان بۆ هەبوونی کۆمەڵگایەکی باشتر، بۆ بەرگریکردن لە خۆت لە مەیدانی شەڕدا و، هەروەها لە دژی ستەمکاریی.

## * (١١)ی سێپتەمبەر و ئوسامە بن لادن

لە وتارێکدا لە (٣١ ی حوزەیرانی ٢٠٠٨ز) لە تەلەفزیۆنی (Peace TV) «نایك» ئەوەی دەرخستووە کە هێرشی (١١ سێپتەمبەر) ڕووداوێکی ڕوون و ئاشکرایە کە ئەو هێرشە لەلایەن جۆرج بۆشەوە ئەنجامدراوە، هەر لە درێژەی قسەکانیدا ئاماژەشی بەوە کردووە کە تەنانەت شێتیش ئەوە دەزانێت کە ئەو هێرشە لەلایەن ئەمریکا و خودی جۆرج بوشەوە ئەنجامدراوە و، ئەو قسانەشی هۆکاربوون بۆ ئەوەی نەهێڵرێت بچێتە ناو خاکی ئەمریکا و کەنەدا، دید و تێڕوانینەکانی «نایك» لە ڕاگەیاندنەکانەوە ڕەخنەی زۆری بە دوای خۆیدا هێنا. لە وەڵامی پرسیارێکدا کە ئایا ئوسامە بن لادن تیرۆریستە یاخود نا؟ «نایك» ئاماژە بەوە دەکات کە هیچ بیروڕایەکی نییە لەسەر بن لادن، بە حوکمی ئەوەی کە نەیبینیوە، یاخود لە نزیکەوە نەیناسیوە، نە دوژمنە و نە تیرۆریست، بەڵام ئەگەر ئەو شەڕی دوژمنانی ئیسلام بکات ئەوا من لەگەڵی دەبم، ئەگەر ئەو ئەمەریکا بە تیرۆریست بزانێت کە گەورەترین تیرۆریستە من لەگەڵی دەبم.

## * تیرۆریزم، کوشتن و تەقینەوەی خۆکوژیی

لە کۆتاییەکانی ساڵی (٢٠١٠ز)دا «نایك» بەرگری لە خۆی کرد کاتێك

قسەیەکیان بە هەڵە لێکدابووەوە کە وتویەتی: «هەموو موسوڵمانێك دەبێت تیرۆریست بێت»، «نایك «بەرامبەر ئەو هەڵە تێگەیشتنە بەرگری لە خۆی کرد و، ئاماژە بەوە دەکات دەڵێت کە ئێستاش ڕام وایە کە دەبێت هەموو موسوڵمانێك دەبێت تیرۆریست بێت، مانای وشەی تیرۆریست چییە؟ لە ناوەڕۆکدا تیرۆریست بە مانای وەستانەوە لە دژی هەموو هۆکارەکانی دژ بە کۆمەڵگا، من مەبەستم ئەو تیرۆریستە نییە کە بەشێوەیەکی باو بەکاردێت بۆ ئەو کەسانەی کە خەڵکانی بێ تاوان لەناودەبەن و دەیانترسێنن، لەم ڕوانگەیەوە من هەرگیز داوا لە موسوڵمانەکان ناکەم کە تیرۆریست بن، «نایك» «هیتلەر» وەك نموونە دێنێتەوە بەوەی کە «هیتلەر» موسوڵمان نەبووە، بەڵام گەورەترین تیرۆریست بووە لە جیهاندا؛ کە نزیکەی (٦ ملیۆن) جولەکەی لەناوبرد.

لە وەڵامی ئەوەی کە «زاکیر نایك» بیروڕای چییە لەسەر کوشتن؟ «نایك» باس لە قورئان دەکات بەوەی ئەگەر کەسێك کەسێکی بێ تاوان بکوژێت موسوڵمان بێت یاخود نا؛ ئەوا وەکو ئەوە وایە تەواوی مرۆڤایەتی کوشتبێت، ئیتر چۆن دەبێت کە موسوڵمان کەسی بێ تاوان بکوژێت؟ تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە کەسێکی تری کوشتبێت، یاخود گەندەڵی لە وڵاتدا خولقاندبێت، هەروەها ڕەخنەی لە ڕاگەیاندن گرت بەوەی دەقێك، یاخود ئایەتێکی قورئان، یان فەرموودەیەك دەهێننەوە بەهەڵە لێکدانەوەی بۆ دەکەن کە گوایە ئایینی ئیسلام ئایینێکە ڕێگە دەدات بە توندوتیژی و کوشتن، هەروەك چۆن بەهەڵە و بە بێ ناوەڕۆك ئەو ئایەتە لێکدەدەنەوە کە خوای گەورە دەفەرموێت: (لەهەر شوێنێك ناموسوڵمانێکتان بینی بیکوژن) بەبێ ئەوەی ئاماژە بەوە بکات کە ئەو ئایەتە لە کاتی جەنگدا دابەزیوە،

ئایینی ئیسلام هەمیشە ئاشتی بەباشترین هەڵبژاردە زانیوە.
لە میانی گۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنوسیدا لە سکایپ و لە وەڵامی پرسیاری ئەوەی کە ئایا «زاکیر نایك» بیروڕای چۆنە سەبارەت بە بۆمبی خۆکوژیی؟ «نایك» لەوەڵامدا ئاماژەی بەوەکرد کە ئەوە ڕێگە پێدراوە لە ئایینی ئیسلامدا کاتێك کە وەکو تاکتیکی جەنگ بەکاردێت، بۆ نموونە لە جەنگی جیهانی دووەمدا یابان ئەو کارەی ئەنجامداوە وەکو تاکتیکی جەنگ، بەڵام کاتێك ئەو بۆمبی خۆکوژییە زیان بە کەسانی بێ تاوان بگەیەنێت ئەوا ڕێگە پێنەدراون.

## * دەوڵەتی ئیسلامی لە عێراق و شام (داعش)

«زاکیر نایك» دەوڵەتی ئیسلامی لە عێراق و شام بە دەوڵەتی دژە ئیسلامی لە عێراق و شام ناوبرد و، وتی: کە دوژمنانی ئیسلام پشتگیری لە دەوڵەتی ئیسلامی لە عێراق و شام دەکەن، چونکە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: (کوشتنی کەسێکی بێ تاوان وەك کوشتنی تەواوی مرۆڤایەتییە) ئیتر چۆن ئەو ڕێکخراوە سەر بە ئایینی ئیسلامە کاتێك کە خەڵکانی بێ تاوان دەکوژن. هەروەها داوا لە هەموو موسوڵمانانی جیهان و ڕاگەیاندنە ئیسلامییەکان دەکەم کە یارمەتی دوژمنانی ئیسلام نەدەن، تاکو پەلاماری ئیسلام بدەن و، نابێت لە ڕاگەیاندنەکانەوە بە دەوڵەتی ئیسلامی لە عێراق و شام ناوبهێنرێن، بەڵکو دەبێت بە دەوڵەتی دژە ئیسلامی لە عێراق و لە شام بانگ بکرێن.

## * پێشوازی، خەڵات، نازناو و ڕێزلێنان

«زاكیر نایك» بە پلەی (٨٩)هەمین دێت لە لیستی (١٠٠ پیاوە بە هێزەكانی وڵاتی هیندستان) و، بە پلەی (٨٢)هەمین دێت لە ساڵی (٢٠٠٩ز)دا بە گوێرەی وتەی «پراڤین سوامی» «نایك» كاریگەرترین بیرمەندی سەلەفییە لە هیندستان و، لە چاپی ساڵەكانی (٢٠٠٩ تاكو ٢٠١٤ز)ی كتێبی (٥٠٠ موسوڵمانە كاریگەرەكان) ناوی «زاكیر نایك» بە ڕێزەوە هاتووە.

- لە مانگی حوزەیرانی ساڵی (٢٠١٣ز)دا «نایك» نازناوی كەسایەتی ئیسلامی ساڵی لە «حەڤدەهەمین خەڵاتی نێودەوڵەتی قورئان»ی پێبەخشرا لەلایەن «محمد بن راشد ئال مەكتوم» حاكمی دوبەی و، وەزیری دارایی و پیشەسازی وڵاتی ئیمارات.

- لە (٥ی مانگی ئۆكتۆبەری ساڵی ٢٠١٣ز)دا بەشی گەشەپێدانی ئیسلامی لە وڵاتی مالیزیا خەڵاتی ڕێزلێنانی بەخشییە «زاكیر نایك» لە لایەن سەرۆكی وڵاتەوە.

- لە(٢ی فێبریوەری ٢٠١٠ز) خەڵاتی نێودەوڵەتی مەلیك فەیصەڵی بۆ خزمەتی ئیسلامی پێ بەخشرا.

- لە ساڵی (٢٠١٣ز)دا خەڵاتی شارقە بۆ كاری خۆبەخشی لەلایەن «سوڵتان بن محمد ئەل قەسیم»ی شازادەی شارقە پێ بەخشرا.

- لە ساڵی (٢٠١٤ز)دا خەڵاتی جیاكەرەوەكانی فەرماندە لە فەرمانی « گامبیا»ی پێبەخشرا لەلایەن «یەحیا جەمیع» سەرۆكی گامبیاوە.

- لە (٢٠١٤ز)دا خەڵاتی دكتۆری پەیامی مرۆڤایەتی لەلایەن زانكۆی گامبیاوە پێبەخشرا.

* هەڕەشەی کوشتن

لە ڕێکەوتی (١٣ی حوزەیرانی٢٠١٦ز) سەرکردەی شوێنی خزمەتی ئایینی هیندۆس **«سیدهاڤی پراچی»** ڕایگەیاند کە (٧٤٠٠٠) دۆلاری ئەمریکی وەکو خەڵات دەدرێت بەو کەسەی کە سەری «زاکیر نایك» لێ بکاتەوە، ئەمە دوای ڕۆژێك لەوەوە هات کە گرووپی «شیا حوسەینی تایگری» بڕی (٢٢٠٠٠ )دۆلاری ئەمریکی وەکو خەڵات دانا بۆ هەرکەسێك کە سەری «زاکیر نایك» لێ بکاتەوە.



**شا سەلمان پاشای سعودییە لەکاتی خەڵات کردنی دکتۆر زاکیر نایک**

# وتەكانی دكتۆر زاكیر نایك

## كۆمەڵێک لە بەنرخترین و بەسودترین
## ووتەکانی دکتۆر زاکیر نایک



١- ئەگەر دەرخستنی جەستەی مرۆڤ پێشکەوتن بێت، ئەوا ئاژەڵ پێشکەوتووترە لە مرۆڤ.

٢- موسوڵمانی پراکتیکی کەسێکە دەزانێت کە بێ خەوش نییە، بەڵکو هەوڵدەدات هەمیشە خۆی باشتر بکات.

٣- قورئان کتێبی زانست نییە، بەڵکو کتێبی هێماکانە.

٤- بە ڕەچاوکردنی بارودۆخەکە ئەگەر بە هەڵەش بوو بێت، چاوێك بەرامبەر چاوێك، ددانێك بەرامبەر ددانێك هەڵەیە.

٥- هەرگیز لە کاتی ئامادەنەبوونی کەسێکدا بە خراپە باسی مەکەن.

٧- من بڕوام بە وشەکانی ئینجیلی پیرۆز هەیە (کە ڕاست بن) هەرچۆنێك کە نوسرابن کە لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا یەك بگرێتەوە، ئەگەر دژ بە قورئان بێت ئەوا من بڕوای پێ ناکەم، من بڕوام بە وانەکانی حەزرەتی مەسیح هەیە کە لەگەڵ قورئان یەکدەگرنەوە .

٨- هەمیشە سەرکۆنە و مەحکومی تیرۆریزم دەکەم، چونکە بە گوێرەی قورئانی پیرۆز ئەگەر تۆ کەسێکی بێ تاوان بکوژیت ئەوا وەك ئەوە وایە کە تەواوی مرۆڤایەتیت کوشتبێت.

٩- ئەگەر كەسێكی موسوڵمان پێی وابێت كە ئایینی ئیسلام ئایینێكی بێ بەزەییە لەگەڵ هەندێك شت كە دەیكات لەگەڵ تیرۆریزم، كاتێك مافی ئافرەتەكان نادات، كاتێك كە دژ بە زانستە ئەوا ئەو ناموسوڵمانە مافی خۆیەتی كە ئەو جۆرە ئیسلامە ڕەت بكاتەوە، كێشەكە ئەوەیە كە ئەو وێنایەكی هەڵەی هەیە سەبارەت بە ئایینی ئیسلام، تەنانەت منیش ئەو شێوەیەم لە ئیسلام پێ قبوڵ نییە، بەڵام لە هەمان كاتدا ئەوە ئەركی منە وەك موسوڵمانێك كە وێنای ڕاستی ئایینی ئیسلام دەربخەم بۆ ناموسوڵمانەكان، وتە و پەیام بدەم كە ئایینی ئیسلام بەبەزەیترین ئایینە، مافی یەكسان دەدات بە ئافرەتان، لەگەڵ عەقڵ و بیركردنەوە و زانستدا ناچوونیەك نییە، ئەگەر من ئەو ڕاستییانەم خستەڕوو؛ ئەوا ڕەنگە ناموسوڵمانەكە ئایینی ئیسلام قبوڵ بكات.

١٠- ئەگەر (بەها گوان)ەکەی تۆ نەتوانێت (شری گانیش)ی کوڕی خۆی بناسێتەوە؛ ئەوا چۆن من دەناسیتەوە ئەگەر کەوتمە ناڕەحەتییەوە؟

١١- ئامۆژگاری من بۆ ئەو کەسانەی کە جگەرە دەکێشن، مانگی ڕەمەزان کاتێکی زۆرباشە کە دەتوانیت بە ڕاستی واز لە جگەرە بهێنیت.

٦- من پیاوی سەلماندنم بە ئاماژەکردن بە کتێبە پیرۆزەکانتان.

١٧- بەدوای ڕاستیدا بگەڕێ، ڕاستی ڕەنگە ئازادت بکات.

١٢- ئەوە بت پەرستی نییە، کەعبە ئاماژەیە بۆ ئاڕاستەی نوێژکردن و، بە سوڕانەوە بە دەوریدا موسوڵمانان وا هەست دەکەن کە خوایەك هەیە لە سەنتەردا، موسوڵمانەکان ماچی کەعبە دەکەن تەنها لەبەرئەوەیە کە پێغەمبەر محەمەد (د.خ) ماچی کردووە.

١٨- کام هیندۆسە لەسەر بتی خواکانیان وەستاون؟ بەڵام محەمەد (د.خ) لەسەر کەعبە وەستاوە لەکاتی بانگکردن بۆ نوێژ؛ لە ماوەی سەرەتاکانی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام، ئەمە باشترین سەلماندنە کە هیچ بت پەرستێك لە ئیسلامدا بوونی نییە، بەڵام لە ئایینی هیندۆسدا هەیە.

١٣- ڕەنگە برا موسوڵمانەكانم پرسیاری ئەوەم لێبكەن بۆچی پیرۆزبایی لە كافر دەكەیت؟ هۆكاری ئەوەی من ئەوە دەكەم ئەوەیە كە ئەوان بڕوایان بە بەشێكی (شەهادە) هەیە، یاخود باوەڕیان بە بەشێكی ئیسلام هێناوە كە (لا اللە)یە، واتە (هیچ خوایەك نییە)، كەواتە نیوەی ئیشەكەی من تەواو بووە، ئێستا تەنها بەشی (الا اللە) واتە (تەنها خوا) ماوەتەوە كە شەهادەكە تەواو ببێتو ئەوەشیان لەگەڵ تەواو دەكەم. ان شاء اللە ئەو ئەركەش تەواو دەكەم لەگەڵ ئەوانی تردا كە كافر نینو بەجۆرێكی نادروست بڕوایان بەخودا هێناوە، سەرەتا پێویستە ئەو چەمكە هەڵەیەی كە بەرامبەر بە خوا هەیانە لە مێشكیان بیسڕمەوە؛ دواتر چەمكی دروستی خوای ڕاستەقینەیان لەلا دروست بكەم.

١٤- بەشێوەیەکی ئاسایی کاتێك من کافرێك دەبینم یەکەم شت کە دەیکەم بریتییە لەوەی پیرۆزباییەکی تایبەتی لێبکەم، چونکە زۆرینەی خەڵك بیروباوەڕێکی کوێرانەیان هەیە، ئەو مەسیحییە چونکە باوکی مەسیحییە، ئەو هیندۆسە چونکە باوکی هیندۆسە، زۆرینەی خەڵك لە جیهاندا کوێرانە شوێن ئەو ئایینە کەوتوون کە باوکیان پەیڕەوی دەکات.

١٥- هیچ بەڵگەیەکی ڕاستەقینە لە بەردەستدا نییە کە ئەوە بسەلمێنێت کە مەسیح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) لە (٢٥ی مانگی دیسەمبەر) دا لەدایکبووە .

١٩- کحول دایکی هەموو خراپەکارییەکە.

١٦- خەڵكی لە پەیامەكە هەڵە تێدەگەن، ئەویش ئەوەیە كە ئەوان پەیڕەوی یاسا دەكەن بە وشە نەك بە ڕۆح، پێویستە تۆ بە ڕۆح پەیڕەوی یاسا بكەیت.

٢٠- هەندێك كەس وابیردەكەنەوە كە ڕێگەپێدراوە كە درۆ بكەیت بۆ گاڵتەكردن، پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت: «نەفرەتی خوا لەو كەسەی كە درۆ دەكات، بۆ ئەوەی خەڵكی پێبكەنن نەفرەتی خوای لێ بێت، نەفرەتی خوای لێ بێت».

٢١- ئەگەر لێكۆڵینەوەت لەسەر ئایینی ئیسلام نەكردووە، تكایە هیچ شتێك سەبارەت بە ئایینی ئیسلام مەڵێ.

٢٢-ئەگەر دەتەوێت سەبارەت بە ئایینی ئیسلام فێربیت، بڕۆ سەبارەت بە ئیسلام لێکۆڵینەوە بکە نەك موسوڵمان، چونکە ئیسلام بێ خەوشە و پێرفێکتە، بەڵام موسوڵمان نەخێر.

٢٣- تۆڕی کۆمەڵایەتی زۆر کاریگەرە، موسوڵمانەکان پێویستە بەکاری بهێنن بۆ ئەوەی کە ڕاستی ئیسلام بڵاوبکەنەوە.

٢٤- سیواك پاککەرەوەی دەمە و، دڵخۆشکەری خوایە.

٣٠- وەك چۆن ئامێرەکان پێویستیان بە ڕێبەری بەکارهێنان هەیە بۆ ئیش کردن، مرۆڤەکانیش پێویستیان بە قورئانە.

٢٥- بانگەواز لە ڕاگەیاندنەوە دیاردەیەکە کە دەگات بە سەدان ملیۆن کەس لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە و، هۆکارە بۆ زیادبوون و گەشەسەندنی ناساندنی ئیسلام.

٢٦- ئەوەی کە خەڵکی درکی پێناکات لە کاتێکدا کە ئاوات دەخوازێت بە (Marry Christmas) ئەوا تۆ ڕازیت بەوەی کە پێغەمبەر مەسیح (علیه السلام) لە (٢٥ ی مانگی دیسەمبەر) لەدایکبووە و، کوڕی خوایە کە ئەوەش هاوبەشی دانانە بۆ خوا.

٢٧- بانگەوازکردنی ئیسلام بۆ ناموسوڵمانەکان لە ئەستۆی هەموو موسوڵمانێکدایە.

٢٨- ڕاگەیاندنی نێودەوڵەتی زانیاری نادروست سەبارەت بە ئیسلام بڵاودەکاتەوە، ئەوە ئەرکی سەرشانی ئێمەیە کە لە ڕێگەی ڕاگەیاندنەوە بەرپەرچی بدەینەوە.

٢٩- ئێمە ناتوانین دەستدرێژی بکەین، ڕەخنە بگرین، قسەی خراپ بکەین سەبارەت بەو ناموسوڵمانانەی کە بانگی بۆ دەکەن لە تەك خوادا.

٣١- لۆمەکردنی دکتۆر «زاکیر نایك» لەبەرامبەر پەلاماری تیرۆریستی بۆ سەر شاری داکا (پایتەختی بەنگلادش)، ئەوە وەکو لۆمەکردنی ئەنشتاین وایە لەبەرامبەر هێرشی ئەتۆمی بۆ سەر هێرۆشیما و ناکازاکی بە بەکارهێنانی هاوکێشەی ($e=mc^2$)بۆ دروستکردنی بۆمبی ئەتۆمی.

٣٥- به ڕای من ڕاگەیاندن گرنگترین چەکە لە دونیادا، دەتوانێت پاڵەوانێك بکات بە خراپ و تەنانەت خراپێکیش بکات بە پاڵەوان.

٣٢- من دڵنیام کە هەموو ئەو تیرۆریستانە کە ڕێی هەڵەیان نیشانداوە و خۆیان وا دەردەخەن کە شوێنکەوتەی من و قورئان بن، ئەوا نە من و نە قورئانیش نابێت لۆمە بکرێین لەبەرامبەر ئەو کارە تۆقێنەرانە، چونکە نە من و نە قورئانیش توندوتیژی بڵاو ناکەینەوە و، هانی کەس نادەین بۆ کوشتنی کەسانی بێ تاوان.

٣٣- تیرۆریزم قۆرغکاری هیچ ئاینێك نییە، ئایینی ئیسلام بە توندی کوشتنی کەسانی بێ تاوان ڕیسوا دەکات.

٣٤- من خوێندکاری ئایینی ئیسلام بە بەراورد بۆ ئایینەکانی تر، لە هیچ ئایینێکی تردا بە ڕوونی نەمبینیوە جگە لە قورئانی پیرۆز، کە بە ئاشکرا بانگەشە بۆ ئەوە بکات کە کوشتنی کەسی بێ تاوان وەکو کوشتنی هەموو مرۆڤایەتییە و، پاراستنی ژیانی کەسێکیش وەکو پاراستنی هەموو مرۆڤایەتییە.

# پرسیاری یەکەم / فرەژنی

**بۆچی لە ئایینی ئیسلامدا پیاوان ڕێگەپێدراون زیاتر لەیەک هاوسەریان هەبێت؟ بۆچی لە ئیسلامدا فرە ژنی ڕێگەپێدراوە؟**

## وەڵام/

**پێناسەی فرەژنی (فرە هاوسەری):**

**١- فرەژنی سیستەمێکی هاوسەرگیرییە، کە تێیدا کەسێك زیاتر لە هاوسەرێکی هەیە.**

**فرە هاوسەری دوو جۆرە:**

**یەکەم/** فرەژنی کە تێیدا پیاوێك زیاتر لە هاوسەرێکی هەبێت.

**دووەمیان/** فرە پیاوی کە تێیدا ئافرەتێك لەیەك کاتدا زیاتر لەیەك پیاوی هەبێت. لە ئیسلامدا فرەژنی سنووردار ڕێپێدراوە، بەڵام فرە پیاوی بەتەواوی ڕێگەپێنەدراوە. ئێستا دێینە سەر پرسیارە ڕاستەقینەکە؛ بۆچی ڕێگە بە پیاو دراوە کە زیاتر لە هاوسەرێکی هەبێت؟

**٢- قورئان تاکە نووسراوی ئایینییە لە جیهاندا دەفەرمووێت: «هاوسەرگیریی تەنها لەگەڵ یەك کەسدا بکەن»**

قورئان تاکە کتێبی ئایینییە لەسەر ڕووی زەوی کە دەستەواژەی:

«هاوسەرگیریی تەنها لەگەڵ یەك کەسدا بکەن»ی تێدایە، هیچ کتێبێکی ئایینی تر نییە کە ڕێنمایی پیاو بکات بە هەبوونی تەنها یەك هاوسەر، تەنانەت لە هیچ کتێبێکی پیرۆزی وەکو ڤێداس، ڕامایان، مەهابهارتا، گیتا، تەلمود و ئینجیلیشدا هیچ ڕێنوێنییەکی پیاو نەهاتووە لە هەبوونی ژمارەی هاوسەردا، بەپێی ئەو کتێبە پیرۆزانەیان پیاو دەتوانێت چەند ئافرەت ئارەزووی بکات بیکات بە هاوسەری خۆی، دوای ماوەیەکی زۆر قەشەکانی ئایینی هیندۆس و کڵێساکانی ئایینی مەسیحی ژمارەی هاوسەرەکان کە پیاوێك بتوانێت هەیبێت کەمکردەوە بۆ یەك هاوسەر. پاشا داشرات باوکی راما زیاتر لە هاوسەرێکی هەبووە، کریشنا چەندین هاوسەری هەبووە لە هەمان کاتدا، تەنانەت لە ئایینی مەسیحییدا هەروابووە، تا چەند سەدەیەك پێش ئێستا کڵێساکان ژمارەی هەبوونی هاوسەریان کەمکردەوە بۆ هەبوونی یەك هاوسەر لەیەك کاتدا.

فرەژنی لە ئایینی جوولەکەشدا شتێکی ڕێگەپێدراو بووە، بەپێی یاسای تالموود ئەبراهام سێ هاوسەری هەبوو، سۆلۆمۆن سەدان هاوسەری هەبووە، ئەم سیستەمی فرەژنییە بەردەوام بووە لە ئایینی جوولەکەدا؛ تاکو ساڵی (**١٩٥٠ز**) سەرۆکی ئیسرائیل رابینەیت هەبوونی فرە ژنی قەدەغە کرد و، ڕێگەی بە هەبوونی تەنها یەك هاوسەردا.

## ٣- فرەژنی لە ئایینی هیندۆسدا زیاترە لە ئایینی ئیسلام:

بەگوێرەی ڕاپۆرتێکی «ئەنجومەنی دۆخی ژنان لە ئیسلامدا» کە لە ساڵی (**١٩٧٥ز**) بڵاوکراوەتەوە، لە لاپەڕە (**٦٦ و ٦٧**)دا ئامارێکی فرە ژنی لەنێوان ئایینی هیندۆس و ئیسلامدا بڵاوکردۆتەوە، کە لەنێوان ساڵەکانی (١٩٥١ بۆ

١٩٦١ز)دا ڕێژەی فرەژنی لەنێوان هیندۆسەکاندا **(٥,٠٦٪)** بووە، لە کاتێکدا لە نێوان مسوڵمانەکاندا **(٤,٣١٪)** بووە، بە گوێرەی یاسای هیندەکان تەنها پیاوی موسوڵمان ڕێگەدراوە کە زیاتر لە هاوسەرێکی هەبێت، نا یاساییە کە پیاوانی ناموسوڵمان زیاتر لە هاوسەرێکیان هەبێت، لەگەڵ ئەوەی کە نایاساییە پیاوانی هیندۆس زیاتر لە پیاوانی ئیسلام فرە ژنییان پەیڕەوکردووە، لەپێشدا هیچ یاسایەك نەبووە بۆ ڕێگەگرتن لە فرەژنی لە ئایینی هیندۆسدا تا ساڵی **(١٩٥٤ز)** یاسایەك پەسەندکرا کە تێیدا نایاسایی بوو شوێنکەوتووانی ئاینی هیندۆس **زیاتر لە هاوسەرێکیان هەبێت**، ئەم قەدەغەکردنی فرەژنییە یاسایەك بوو بڕیاری لەسەردراوە، نەك ئەوەی لە کتێبی پیرۆزی هیندۆسەکاندا هاتبێت، **ئێستا باباسی ئەوەش بکەینەوە کە ئایا بۆچی ئیسلام ڕێگەی دا کە زیاتر لە هاوسەرێکت هەبێت؟**

## ٤- قورئان ڕێگە بە فرەژنی سنووردار دەدات.

قورئان تاکە کتێبی ئاینییە کە تێیدا هاتووە: «تەنها یەك هاوسەرتان هەبێت»، ئەم دەستەواژەیە لە (ئایەتی٣ لە سوورەتی **النساء**)دا هاتووە کە خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ مَثْنَى وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَلِكَ أَدْنَى أَلَّا تَعُولُوا) (قورئان ٤:٣) واتە :(خۆ ئەگەر کە بە دادگەرانە نەتوانن ڕەفتار لەگەڵ کیژە هەتیوەکاندا بکەن، دەسا ئەو ژنانە مارە بکەن پێتان دەشێن، دوان دوان، سیان سیان، چوار چوار، واتە هەریەکێکتان دەتوانن هەتا چوار ژن مارەبکەن بەمەرجی عەدالەت و واتای ژیاندنیان، خۆ ئەگەر ترسان نەتوانن بە دادگەرانە وەکو یەك تەماشای ژنەکانتان بکەن

دەبێت تەنها یەك ژن مارە بکەن وە یان بەو کەنیزانە دەستتان کەوتون و بوونەتە موڵکتان قەناعەت بکەن ئا بەوشێوەیە نزیکترە کە غەدر و ستەم لە ژنان نەکەن)، پێش ئاشکراکردنی قورئان هیچ سنوورێکی ئاسمانی نەبوو بۆ فرەژنی، پیاوەکان ژمارەیەکی زۆر لە هاوسەریان هەبووە، ئیسلام فرەژنی سنووردارکرد بۆ چوار هاوسەر، ئیسلام ڕێگە بە پیاو دەدات بە هەبوونی زیاتر لەیەك هاوسەر تاکو چوار، بەڵام ئەم ڕێگەپێدانە لە حاڵەتێکدایە کە پیاوەکە بتوانێت بەیەکسانی و بە بێ جیاوازی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکات، وەك ئەوەی لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە: (وَلَنْ تَسْتَطِيعُوا أَنْ تَعْدِلُوا بَيْنَ النِّسَاءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ فَلَا تَمِيلُوا كُلَّ الْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَالْمُعَلَّقَةِ وَإِنْ تُصْلِحُوا وَتَتَّقُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَحِيمًا) (النساء ٤:١٢٩)، واتە: (دڵنیاشبن هەرگیز ناتوانن هەرچەندە هەوڵیش بدەن کە بە یەکسانی و بەبێ جیاوازی لەگەڵ ژنانی خۆتاندا هەڵ بکەن، جا کەوابوو ئەوەندە دووریان مەخەنەوە لە خۆتان، هەتا بیانکەنە هەڵسپاردە و داماو بن، ئەگەر لەگەڵیان پێك بێن و لە گوناح خۆ بپارێزن و لە خواربوونەوە لە بڕیارەکانی خوا بەرامبەریان پارێز بکەن، ئەوا بەڕاستی خوا لێبووردە و بە ڕەحمە و میهرەبانە)، زۆر کەسە بە هەڵە تێگەیشتوون لەوەی کە پیاوی موسوڵمان ناچارکراوە بە زۆر زیاتر لەیەك هاوسەریان هەبێت، بەڵام بەشێوەیەکی فراوان ئایینی ئیسلام پێنج گرووپی هەیە لە ڕێگەپێدراو و ڕێگەپێنەدراوەکان، بەم شێوەیە:

**أ- فەرز:** بەزۆر یان ناچاری.

**ب- مستحب:** ڕاسپاردن یان هاندان.

**ج- موباح:** ڕێگەپێدراو.

**د- مەکروهـ:** پێشنیار نەکراو.

**هـ- حەرام:** ڕێگەپێنەدراو یان قەدەغەکراو.

فرەژنی دەکەوێتە ناوەڕاستی ئەو پێنج گرووپەوە کە ڕێگەپێدراوە، ناتوانرێت ئەوە بوترێت کە ئەو پیاوە موسوڵمانەی کە دوو، یان سێ، یان چوار هاوسەری هەیە، باشترە لە پیاوێك کە تەنها یەك هاوسەری هەیە.

## ٥- تێکڕای ماوەی ژیانی مێ زیاترە لە ژیانی نێر.

لە ڕووی سروشتەوە نێر و مێ بەنزیکەیی هاوتان، بەڵام منداڵی کچ بەرگری زیاترە لە منداڵی کوڕ، منداڵی کچ لە توانایدایە باشتر وەك لە منداڵی کوڕ بەرەنگاری بەکتریا و نەخۆشی بێتەوە، هەر لەبەر ئەمەشە کە لە ماوەی تەمەنی منداڵیدا مردنی منداڵی کوڕ زیاترە بەبەراورد بە مردنی منداڵی کچ، ئەمەش سەلمێنراوە لەلایەن پزیشکی تایبەت بە منداڵانەوە. لە ماوەی جەنگدا ڕێژەی کوژراوانی پیاو زیاترە بەبەراورد بە ئافرەتان. لە هەمان کاتدا ڕێژەی مردنی پیاو بە هۆی ڕووداو و نەخۆشییەکانەوە زیاترە. لە ئەنجامدا ڕێژەی ئەو ئافرەتانەی کە پیاوەکانیان دەمرێت و بێوەژن دەبن زیاد دەبێت.

## ٦- هیندەکان ڕێژەی دانیشتووانی پیاویان زیاترە بەهۆی «ساواکوژی»، «کۆرپەلە کوژی»یەوە.

هیندستان یەکێکە لەو وڵاتانەی کە ڕێژەی مێ کەمترە لە ڕێژەی نێر لە ژمارەی دانیشتوواندا. هۆکاری سەرەکی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئاستی بەرزی ساواکوژی و کۆرپەلە لەناوبردن لە وڵاتی هیندستان و، ئەوە ڕاستییە کە ساڵانە یەك ملیۆن ئافرەت کۆرپەلەکانیان لەبار دەبەن، دوای ئەوەی کە

بۆیان دەردەکەوێت کە کۆرپەلەکانیان کچ بوون. ئەگەر ڕێگری بکرێت لەم کارە خراپانە ڕێژەی مێ زیاتر دەبێت بەبەراورد بە ڕێژەی نێر لە وڵاتدا .

## ٧- لەسەر ئاستی دونیا ڕێژەی مێ زیاترە لە ڕێژەی نێر.

لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئافرەت بە ڕێژەی حەوت بۆ هەشت ملیۆن زیاترە لە پیاو. بە تەنها نیویۆرك (یەك ملیۆن) ئافرەتی زیاترە لە چاو ژمارەی پیاودا و، لەو ڕێژە پیاوەی کە هەیە یەك لەسەر سێی پیاوەکانیان هاوڕەگەزبازن، ئەمە بە مانای ئەوە دێت کە ئەو پیاوانە ئـارەزووی هاوسەرگیریی ناکەن لەگەڵ ئافرەتدا. لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا زیاتر لە (٢٥ ملیۆن) هاوڕەگەزبازی پیاو هەیە. لە وڵاتی بەریتانیا ژمارەی ئافرەتان (چوار ملیۆن) زیاترە لە پیاو. لە ئەڵمانیا (پێنج ملیۆن) ئافرەت زیاترە لە پیاو. لە ڕووسیاش (حەوت ملیۆن) ئافرەت زیاتر لە پیاوان هەیە. تەنها خوا خۆی دەزانێت کە ڕێژەی ئافرەت چەند زیاترە بە بەراورد بە ڕێژەی پیاو لە هەموو دونیادا.

## ٨- دیاریکردنی هەر پیاوێك یان هەموو پیاوەکان بە هەبوونی تەنها یەك هاوسەر کرداریی نییە.

هەرچەندە ئەگەر هەموو پیاوەکان یەك هاوسەریان هەبێت؛ ئەوا هێشتا (٣٠ ملیۆن) ئافرەت لە ئەمەریکا دەمێنێتەوە کە ناتوانن پیاویان هەبێت (بەڕەچاوکردنی ئەوەی کە ئەمەریکا بیست و پێنج ملیۆن هاوڕەگەزبازی هەیە). (پێنج ملیۆن) ئافرەت لە ئەڵمانیا و (نۆ ملیۆن) لە ڕووسیا دەمێنێتەوە کە پیاویان نابێت. وا دابنێ کە خوشکەکەم یەکێك بێت لەو ئافرەتانەی

که له ئەمەریکا هاوسەرگیری ناکات، یان وا دابنێ خوشکەکەت یەکێك بێت لەو ئافرەتانەی که له ئەمەریکا هاوسەرگیری ناکەن، ئەوا لەو کاتەدا تەنها دوو بژاردە دەمێنێتەوە بۆ ئەو: یان دەبێت شوو بە پیاوێك بکات که هاوسەرێکی تری هەیە، یان دەبێت ببێت به سامانی گشتی، بێجگە لەم دوانە هیچ بژاردەیەکی تر نامێنێتەوە.

له کۆمەڵگەی ڕۆژئاواییدا شتێکی باوە که پیاو دۆستی هەبێت، لەم حاڵەتەدا ئافرەت تووشی بێ ئومێدیی دەبێت و، ژیانێکی نا پارێزراوی دەبێت، هەمان کۆمەڵگا ناتوانێت ئەوە قبوڵ بکات که پیاوێك زیاتر لەیەك هاوسەری هەبێت؛ که تیایدا ئافرەت پێگەی خۆی دەبێت له کۆمەڵگەدا و، ژیانێکی پارێزراوی دەبێت. لەنێوان ئەو دوو بژاردەیەی که پێشتر باسمانکرد ئایینی ئیسلام پێگەیەکی بەڕێز دەبەخشێت به ئافرەت؛ ئەویش به جێبەجێکردنی بژاردەی یەکەم و ڕەتکردنەوەی بژاردەی دووەم، ئەویش به شووکردنی به پیاوێك که هاوسەرێکی تری هەبێت. چەندین هۆکار هەیە که بۆچی ئیسلام ڕێگەی به فرەژنی سنووردار داوە، بەڵام له گرنگترینیان بۆ پاراستنی ناسکیی ئافرەتە.

# پرسیاری دووەم/ فرە پیاوی

**ئەگەر ڕێگە بە پیاو درابێت کە زیاد لە هاوسەرێکی هەبێت، ئەی بۆچی ئاینی ئیسلام ڕێگەی بە ئافرەت نەداوە زیاتر لە پیاوێکی هەبێت؟**

## وەڵام:

زۆر لە خەڵك بە هەندێك لە موسوڵمانانیشەوە ئەو پرسیارە دەکەن کە بۆچی لە ئیسلامدا مافی هەبوونی زیاتر لەیەك هاوسەریان داوە بە پیاو، بەڵام ئەو مافەیان لە ئافرەت قەدەغەکردووە. با سەرەتا ئەوە دووپات بکەمەوە کە کۆمەڵگەی ئیسلامی یەکسان و دادپەروەرە. خوا ژن و پیاوی بەیەکسانی درووستکردووە؛ بەڵام بە توانا و لێپرسراوێتی جیاوازەوە، پیاوان و ئافرەتان جیاوازن لە ڕووی جەستەیی و دەروونییەوە، ڕۆڵ و کاریگەرییان جیاوازە، ژن و پیاو لە ئیسلامدا یەکسانن، بەڵام لە هەموو ڕوویەکەوە نا.

لە قورئانی پیرۆزدا لیستی ئەو ئافرەتانەی باسکردووە کە ناتوانرێن هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بکرێت و، زیاتر و بە وردی لە (سوورەتی النساء) دا خوای گەورە دەفەرموێت: وَلَا تَنْكِحُوا مَا نَكَحَ آبَاؤُكُمْ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَمَقْتًا وَسَاءَ سَبِيلًا (٢٢) حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالَاتُكُمْ وَبَنَاتُ الْأَخِ وَبَنَاتُ الْأُخْتِ وَأُمَّهَاتُكُمُ اللَّاتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ مِنَ الرَّضَاعَةِ وَأُمَّهَاتُ نِسَائِكُمْ وَرَبَائِبُكُمُ اللَّاتِي فِي حُجُورِكُمْ مِنْ نِسَائِكُمُ اللَّاتِي دَخَلْتُمْ بِهِنَّ فَإِنْ لَمْ تَكُونُوا دَخَلْتُمْ بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلَائِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلَابِكُمْ وَأَنْ تَجْمَعُوا بَيْنَ الْأُخْتَيْنِ

إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَحِيمًا) (قورئان ٤: ٢٢ تا ٢٣) واته: (ئەو ژنانە مەخوازن کە باوکتان مارەی کردوون بۆ خۆیان واتە ژنی باوکت «باوەژن» یاساغە لێت، مەگەر ئەوەی لەسەردەمی نەفامیدا بووە، بۆ ئەوە گوناهتان لەسەر نابێ چونکە تێپەڕیوە، بێگومان مارەکردن و سەرجێی ئەمانە کارێکی زۆر ناپەسەند و زۆر نابەجێ و بێزراوە، ڕێبازێکی زۆر خراپ و ناشیرینە ئەو یاسایە، دایکتان، واتە: دایکی خۆتان و دایکی باوك و دایکی دایك حەرامە، کچانتان و خوشکتان و خوشکی باوکتان و خوشکی دایکتان و کچی برا و کچی خوشك و ئەو ژنانەی بە ساوایی شیریان پێداون **«دایکی شیری»** و ئەو کچانەی هاوشیرتان بوون و دایکی ژنتان و ئەو کچانەی خۆتان بەخێوتان کردوون لەو ژنانە بن ئێوە چووبنە لایان، خۆ ئەگەر لەگەڵیان نەخەوتبون ئەوا گوناحێکتان لەسەر ناکەوێ کچەکانیان مارە بکەن و هەروەها قەدەغەیە حەڵاڵی ئەو کوڕانەیشتان مارە بکەن و دوو خوشکیش پێکەوە کۆ بکەنەوە و بیانکەنە هاوسەری خۆتان لەیەك کاتدا ڕەوا نییە، مەگەر لە ڕابـردوودا بەسەرتانا هاتبێ و لەسەردەمی نەزانیو نەفامیدا کردبێتان ئەوە تێپەڕیوە و لەسەرتان ناکەوێ، بەڕاستی خوا سەبارەت بەوانە هەمیشە زۆر لێبوردە و دلۆڤان و میهرەبانە).

**ئەم خاڵانەی خوارەوە هۆکارەکانی ڕێگەنەدان بە فرەپیاوی لە ئیسلامدا ڕوونکردووەتەوە:**

١- ئەگەر پیاوێك زیاتر لە هاوسەرێکی هەبێت، ئەو منداڵانەی کە لەو هاوسەرگیرییە لە دایك دەبن بە ئاسانی دەناسرێنەوە، دایك و باوکیان ئاشکران، لە حاڵەتی ئەوەی ئافرەتێك چەند پیاوێکی هەبێت تەنها دایکی ئەو منداڵانە ئاشکرایە کە لەو هاوسەرگیرییەوە لەدایکبوون، بەڵام باوکیان ڕوون نییە کە کام لە هاوسەرەکانێتی، ئیسلام گرنگییەکی زۆر دەدات بە ناسنامەی دایك و باوکی منداڵ، دەروونناسان ئەوەمان پێدەڵێن کە ئەو منداڵانەی کە دایك و باوکی خۆیان ناناسن بە تایبەتی باوکیان، تووشی زەبری دەروونی و ناخۆشی دەبنەوە، زۆرجار سەردەمی منداڵی بە ناخۆشی تێدەپەڕێت و، لە خوێندنگاش بەهۆی نەزانینی باوکی ڕاستەقینەیەوە تووشی باری دەروونی ناخۆش دەبێت و، هەر کاتێك پرسیاری ناوی باوکی منداڵەکە لە دایکی بکرێت ئەوا دەبێت دایکەکە ناوی دوو باوك یان زیاتر بڵێت! هەرچەندە لە سوودەکانی زانستی نوێ دەتوانیت لە ڕێگەی پشکنینی جینەکانەوە دایك و باوکی منداڵ دیاری بکەیت.

**٢- سروشتی پیاو بە بەراورد بە ئافرەت.**

**٣- لەڕووی بایۆلۆجییەوە بۆ پیاو جێبەجێکردنی ئەرکەکانی ئاسانترە؛** سەرباری هەبوونی چەند هاوسەرێك لەیەك کاتدا، بەڵام ئافرەتێك لەهەمان پێگەدا جێبەجێکردنی ئەرکەکانی وەکو

ئافرەتێك جێبەجێ ناكات بەرامبەر بە پیاوەكانی، چونكە ئافرەت تووشی چەندین گۆڕانكاری دەروونی و ڕەفتاری دەبێتەوە بەهۆی بوونی سووڕی مانگانەوە.

**٤- ئەگەر ئافرەتێك لەهەمان كاتدا چەند پیاوێكی هەبێت؛** ئەوا لە ئەنجامی كرداری سێكسكردنی هەموو پیاوەكانی لەگەڵیدا ئەگەرێكی زۆری دەركەوتنی نەخۆشییەكانی كۆئەندامی زاوزێ ببێتەوە و، لە ڕێگەی سێكسەوە ئەو نەخۆشییانە بگوازرێتەوە بۆ هەموو پیاوەكانی، ئەگەرچی هیچ كام لە پیاوەكانی لە دەرەوەی ئەو پەیوەندییە هاوسەرگیرییە پەیوەندی سێكسی تریان لە دەرەوەش نەبێت، بەڵام لە حاڵەتی ئەوەی پیاوێك چەند هاوسەرێكی هەبێت ئەوا تووشی ئەو نەخۆشییانە نابن.

ئەو هۆكارانەی سەرەوە ئەو هۆكارانەن كە دەتوانرێت بە ئاسانی دیاری بكرێن و، چەندین هۆكاری تر هەن كە بۆچی خوای گەورە بەو هەموو دانایییەوە فرە پیاوی قەدەغەكردووە.

# پرسیاری سێهەم/ حیجاب بۆ ئافرەتان

## بۆچی ئیسلام پلەی ئافرەت کەمدەکاتەوە بە هێشتنەوەیان لە پشت پەچەوە؟

## وەڵام/

پلەوپایەی ئافرەت لە ئیسلامدا زۆرجار ئامانج بووە بۆ پەلامارەکانی دونیا، «حیجاب» یاخوود ئەو جلوبەرگەی کە ئافرەتی موسوڵمان دەیپۆشێت، لەلایەن زۆر کەسەوە وەکو نموونەیەك بۆ ملکەچبوون دەهێنرێتەوە لە ژێر سایەی یاساکانی ئیسلامدا. پێش ئەوەی هۆکارەکانی پشت پۆشینی حیجاب باسبکەین، با سەرەتا لێکۆڵینەوەیەك بکەین لەسەر پلەی کۆمەڵایەتی ئافرەت لە پێش هاتنی ئیسلام:

### ١- لەپێشدا ئافرەت بەکەم سەیرکراوە و، وەکو ئامرازێك بەکارهاتووە بۆ پڕکردنەوەی ئارەزووەکانیان.

ئەمانەی خوارەوە چەند نموونەیەکی مێژوویین؛ ڕاستی پێگەی کۆمەڵایەتی ئافرەت لە شارستانییە سەرەتاییەکاندا دەردەخەن کە چەند لاواز بووە، بەشێوەیەك مافە سەرەتاییەکانی مرۆڤیشیان پێ ڕەوانەبینیون:

### أ. شارستانی بابلیۆنییەکان:

ئافرەت بەکەم سەیرکراوە لە ژێر سایەی یاسای بابلیۆنییەکان هەموو مافەکانیان زەوت کرابوو. ئەگەر پیاوێك ژنێکی بکوشتایە ئەوا لە جیاتی

ئەوەی پیاوەکە سزا بدرێت هاوسەرەکەیان دەکوشت.

### ب. شارستانیەتی یۆنانی:

شارستانیەتی یۆنانی شکۆدارترین شارستانی بووە لەنێوان شارستانییە کۆنەکاندا، لە ژێر ئەم سیستەمە شکۆمەندەدا ئافرەتان لە هەموو مافەکانیان بێبەشکرابوون و، لە خوارەوە تەماشا دەکران. یۆنانییەکان ئافرەتیان لە پیاو بەکەمتر زانیوە، هەرچەندە پاکیزەیی ئافرەت زۆر بە نرخ بوو و، لە ڕێزێکی بەرزدا دادەنرا، دواتر یۆنانییەکان بەهۆی خۆبەزلزانین و دەستدرێژی و ڕەفتاری نابەجێی سێکسی و، کرداری داوێن پیسی بوو بە کردارێکی ئاسایی لەنێوان هەموو چینەکانی کۆمەڵگای یۆنانی، بەهۆی ئەمانەوە هەرەسیان هێنا.

### ج. شارستانیەتی ڕۆمانییەکان:

کاتێك ڕۆمانییەکان لە لوتکەی شکۆمەندیدا بوون، پیاو مافی ئەوەی پێدرابوو کە ژیان لە هاوسەرەکەی خۆی بسێنێتەوە، دەستدرێژی سێکسی و، دیاردەی ڕووتی ئافرەتان شتێکی باو بوو لە ناو ڕۆمانییەکاندا.

### د. شارستانیەتی میسری:

میسرییەکان ئافرەتانیان بە شەیتان لە قەڵەم دەدا و، وەکو هێمایەکی شەیتانی تەماشایان دەکرد.

**٥. عەرەبی پێش ئیسلام:**

پێش ئەوەی ئاینی ئیسلام لەناو عەرەبدا بڵاوبێتەوە، عەرەبەکان زۆر بەکەم بایەخ تەماشای ئافرەتیان دەکرد، زۆرجاریش کاتێك منداڵێکی کچ لەدایك دەبوو زیندە بەچاڵیان دەکرد.

**٢- ئیسلام (١٤٠٠ ساڵ) پێش ئێستا، ئافرەتی بەرزکردەوە و، یەکسانی پێداون و، ڕێنوێنی کردوون بۆ ڕێکخستنەوەی بارودۆخیان و، مافەکانی بۆیان دەستەبەرکرد.**

## حیجاب بۆ پیاوان

خەڵکی هەمیشە باسی حیجاب دەکەن بۆ ئافرەتان، هەرچەندە لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە ئاماژەی بۆ حیجابی پیاوان کردووە پێش ئافرەتان ئەویش لە (سوورەتی نور)دا خوای گەورە دەفەرموێت: (قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ) (النور:٣٠) **واتە: (بە پیاوانی بڕوادار بڵێ چاو بنوقێنن لە ئاستی ژنانی نامەحرەمدا و داوێن و عەورەتی خۆتان بپارێزن ئەوە باشترە بۆیان، بێگومان خوا بەو هەموو ئاکارانەیان ئاگادارە).** بە مانایەکی تر لەو کاتەی کە پیاوێك تەماشای ئافرەتێك دەکات ئەگەر هەر بیرێکی بێ شەرمانە بە مێشکیدا بێت ئەوا پێویستە کە چاوەکانی دابخات و تەماشای ئافرەتەکە نەکات. لە ئایەتی دوای ئەوە خوای گەورە ئاماژەی بۆ حیجابی ئافرەتان کردووە و دەفەرموێت: (قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ (٣٠) وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ

يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَى عَوْرَاتِ النِّسَاءِ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِنْ زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ). واتە: (بە ژنانی بڕوادار بڵێ با چاویان دابخەن و تەماشای نامەحرەم نەکەن و عەورەتیشیان بپارێزن لە گوناە، زینەت و جوانی و خشڵی خۆیان دەرنەخەن لە ئاستی نامەحرەمدا بێجگە لەو ئەندامانەی کە لە کاتی ئیش و کاری ناو ماڵدا دەردەکەون وەکو دەم و چاو و هەردوو دەست، با گۆشەی سەرپۆش و لەچکەکانیان بدەن بەسەر سنگیشیاندا تا گەردن و سنگ و بەرۆکیان دەرنەکەوێ و خشڵ و جوانی و زینەتیان «سەر و مل و گوێ و سینگ و قۆڵ و باڵ و لاقیان» دەرنەخەن بۆ مێردەکانیان نەبێت یان بۆ باوکیان یان باوکی شووەکانیان یان بۆ کوڕی خۆیان یان بۆ کوڕانی مێردەکانیان یان بۆ براکانی خۆیان یان کوڕی براکانیان یان کوڕی خوشکەکانیان یان ژنە بەندیەکانیان «کەنیزەکان» یان پیاوانی شوێنکەوتوانی ژنان بێ ئارەزوو و بێ نیاز «ئەوانەی هەستی ژن و مێردایەتیان نیە» یان ئەو منداڵانەی ئاگایان لە بەدەن و جێی شەرمی ژنان نییە و هێشتا بالغ نەبوون وە هەروەها ژنان لە کاتی ڕۆشتندا نابێ پێیان بە زەویدا بدەن کە بزانرێت خشڵ و زینەتێکیان داشاردووە، کەوابوو ئەی باوەڕداران هەمووتان بەرەو لای خوا بگەڕێنەوە و پەشیمان ببنەوە چاوتان لە ئاستی نامەحرەمدا دابخەن و عەورەتان بپارێزن، بەشکو گشتیان هەم

له دونیا و هەم له قیامەتدا رزگار و بەختیاربن و بۆ هەتا هەتایه له گوناه و سەرپێچی دووربکەونەوه) (نور٣١).

## ٣- شەش بنچینەی حیجاب

به پێی قورئان و سونەت شەش بنیچینه هەیه بۆ پەیڕەوکردنی حیجاب:

**یەکەم بنچینه له پەیڕەوکردنی حیجاب:** بریتییه له داپۆشینی جەسته، ئەم بنچینەیه له ئافرەت و پیاودا جیاوازه، له پیاودا پێویسته له ئاستی ناوك تاکو ئەژنۆی داپۆشراوبێت، بۆ ئافرەتان پێویسته تەواوی جەستەی داپۆشراوبێت جگه له دەم و چاو و دەستەکانی تاکو مەچەك، ئەگەر ئارەزوویان بوو ئەوا دەتوانن ئەو دوو بەشەش داپۆشن. هەندێك له زانایانی ئیسلام ڕایان وایه که دەبێت ئەو دوو بەشەی جەستەش داپۆشرێت و، ئافرەتانی موسوڵمان ناچار دەکەن به ئەنجامدانی. ئەو پێنج بنچینەیی که ماوەتەوه هەمان شێوەن لەنێوان پیاو و ئافرەتدا.

**دووەم بنچینه:** ئەو جل و بەرگانەی که دەپۆشرێن پێویسته پان بن و، شێوەی جەستەیان دەرنەخات .

**سێیەم بنچینه:** ئەو جل و بەرگانەی که دەپۆشرێن نابێت تەنك بێت و، جەسته له ناویدا دەربکەوێت.

**چوارەم بنچینه:** جل و بەرگەکان نابێت سەرنجڕاکێش بن بۆ ڕەگەزی بەرامبەر.

**پێنجەم بنچینه:** ئەو پۆشاکانەی که لەبەر دەکرێن نابێت له هی ڕەگەزی بەرامبەر بچێت.

**شەشەم بنچینه:** ئەو پۆشاکانه نابێت له جل و بەرگی بێ باوەڕەکان

بچێت، بۆ نموونە نابێت جل و بەرگەکان هێما و سمبوڵی تایبەتی ئایینی بێباوەڕان بێت.

## ٤- حیجاب ڕەوشـت و ڕەفتار و هەڵسوکەوت لەنێوان شتەکاندا لەخۆدەگرێت.

حیجابی تەواو لە پاڵ ئەو شەش بنچینەیەی جلوبەرگ کە باسمانکرد؛ ڕەفتاری ئەخلاقی و ڕەوشت و ئامانجی تاك لەخۆدەگرێت، تەنها کەسێك دەتوانێت بنچینەکانی حیجاب جێبەجێ بکات کاتێك کە حیجابی چاوەکان و، حیجابی دڵ و، حیجابی بیرکردنەوە و، حیجابی تێڕوانین پەیڕەو بکات، لەگەڵ ئەوانەشدا حیجاب شێوەی ڕۆیشتنی کەس و شێوەی قسەکردن و ڕەفتارکردن ....هتد لەخۆدەگرێت.

## ٥- حیجاب ڕێگری دەکات لە ئازاردان.

هۆکاری ئەوەی کە بۆچی لە قورئاندا بڕیاری حیجاب بۆ ژنان دەرکراوە، لە سوورەتی ئەحزابدا لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا) (الأحزاب: ٥٩) **واتە: (ئەی پێغەمبەر بە ژنەکانت، کچەکانت و ژنانی باوەڕداران بڵێ باڵاپۆش و عاباکانیان بپێچن بە خۆیاندا، ئەو خۆ داپۆشینە لەبارترین شتە کە ئێوە بە پاك و خاوێنی داوێن پارێزی بناسرێن و بەر قسە و بوختان نەکەون و ئازار و ئەزیەت نەدرێن هەمیشە خوا چاوپۆشیکارە).** قورئان دەفەرموێت کە حیجاب بڕیاری لەسەر دراوە بۆ ئافرەتان تاکو بناسرێتەوە و بیانپارێزێت

لە ئەزیەتدان.

## ٦- نموونەی دوو خوشکە دوانەکە.

وا دابنێ دوو خوشکی دوانە هەمان جوانییان هەبێت لە شەقامێکدا ڕێ بکەن، یەکێکیان حیجابی ئیسلامی پۆشیبێت، بە مانایەکی تر تەواوی جەستەی داپۆشی بێت جگە لە دەم و چاو و دەستەکانی و، خوشکەکەی تری جل و بەرگی ڕۆژئاوایی پۆشیبێت، تەنوورەیەکی کورتی لەبەرکردبێت و، لەو دەوروبـەرەش ئاژاوەچی یان ڕێگرێك هەبێت کە لەسەر ڕێی کچاندا وەستابێت، ئایا گێچەڵ بە کامیان دەکات؟ ئەو کچە کە حیجابی پۆشیوە یان ئەوەیان کە تەنوورەی کورتی لەبەرکردووە؟ بەدڵنیاییەوە ئەو کچەی کە تەنوورە کورتەکەی لەبەرکردووە، چونکە جل و بەرگی ئاوەها بانگهێشتکردنێکی ناڕاستەوخۆیە بۆ ڕەگەزی بەرامبەر؛ بۆ دەستدرێژیکردن و ئەزیەتدانی، قورئان بە ڕەوانـی دەفەرموێت کە حیجاب ئافرەت دەپارێزێت لە گێچەڵ و ئەزیەتدان.

## ٧- سزای لە سێدارەدان بۆ ئەو کەسانەی لاقەی ئافرەتان دەکەن.

لەژێر سایەی شەریعەتی ئیسلامدا ئەگەر پیاوێك ددانی بەوەدا نا کە ئافرەتێکی لاقە کردووە، یان دەستدرێژی سێکسی کردووەتەسەر؛ ئەوا سزای لە سێدارەدان بەسەریدا جێبەجێ دەکرێت، زۆر کەس سەرسام دەبن بەم ڕستە ڕەق و وشکە، تەنانەت هەندێکیان دەڵێن کە ئیسلام ئایینێکی بێ ڕەحم و دڕندەیە!

من پرسیارێکی سادە لە سەدان خەڵکی ناموسوڵمان دەکەم، وا دابنێ خوانەخواستە کەسێك دەستدرێژی سێکسی دەکاتە سەر خێزانەکەت، دایکت یان خوشکەکەت و تۆش دادگایەك دروست بکەیت و ئەو کەس کە دەستدرێژییەکەی ئەنجامداوە بهێنرێتە بەر دەستت، چ سزایەك بەسەریدا جێبەجێ دەکەیت؟ هەموویان دەڵێن دەبێت بکوژرێت، بەڵام ئەگەر هەمان تاوان بەرامبەر بە هاوسەر یان دایك یان خوشکی کەسێك بکرێت، ئەوا سزای لە سێدارەدان بڕیارێکی دڕندانەیە؟

## ٨- کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی داوای بەرزکردنەوەی پایەی ئافرەت دەکات.

ڕۆژئاواییەکان قسە دەکەن سەبارەت بە ئازادی ئافرەتان، ئەمە هیچ نییە تەنها گۆڕانکارییە لە بەکارهێنانی جەستەی ئافرەتان و بەکەم سەیرکردنی ڕۆح و بێبەشکردنیانە لە شکۆمەندیی، کۆمەڵگای ڕۆژئـاوایـی داوا دەکات پێگەی کۆمەڵایەتی ئافرەتان بەرز بکرێتەوە، بەڵام لەبەرامبەردا بەشێوەیەکی واقیعی بەکەم تەماشایان دەکات، ئافرەتان و خانمان بوون بە ئامرازێکی پەتی بۆ دەست ئەو کەسانەی کە بەدوای چێژبینیندا دەگەڕێن، یان بۆ مەبەستی پڕکردنەوەی ئـارەزووی سێکسی کە لەپشت شاشە ڕەنگاوڕەنگەکانی «هونەر» و «کەلتور»دا شاردراونەتەوە.

## ٩- ئەمەریکا بەرزترین ئاستی دەستدرێژی تۆمارکردووە.

ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە یەکێك لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی دونیا دادەنرێت، لەهەمان کاتدا زۆرترین ئاستی دەستدرێژی سێکسی

لەسەر ئاستی جیهان لەو وڵاتەدا تۆمارکراوە. بە گوێرەی ڕاپۆرتێکی FBI لە ساڵی (١٩٩٠ز)دا هەموو ڕۆژێك بە تێکڕای (١٧٥٦) حاڵەتی دەستدرێژی سێکسی ئەنجام دراوە، تەنها لە ئەمەریکا و، دواتر لە ڕاپۆرتێکی تردا ئاماژە بە (١٩٠٠) حاڵەتی دەستدرێژی سێکسی دراوە لە ئەمەریکا، بەڵام لە و ڕاپۆرتەدا ئاماژە بە ساڵەکە نەدراوە ڕەنگە ساڵی (١٩٩٢ز) یان (١٩٩٣ز) بێت. ئایا ئەگەر حیجابی ئیسلامی لە وڵاتی ئەمەریکا پەیڕەو بکرێت و، ئەگەر پیاو کاتێك سەیری ئافرەتێك بکات و خەیاڵێکی بێ شەرمانە بە مێشکیدا هات سەری دابخات و، تەواوی جەستە بێجگە لە لە دەم و چاو و دەست داپۆشرێت و، هەرکەسێك کە دەستدرێژی سێکسی ئەنجام دا سزای لە سێدارەدان بەسەریدا جێبەجێ بکرێت؛ ڕێژەی دەست درێژی سێکسی لە ئەمەریکا بەرز دەبێتەوە؟ یاخود ڕێژەکە کەم دەبێتەوە؟

## ١٠- ئامرازەکانی شەریعەتی ئیسلام ڕێژەی دەستدرێژی سێکسی کەم دەکاتەوە.

بەشێوەیەکی سروشتی هەر کە ئامرازەکانی شەریعەتی ئیسلام پەیڕەو بکرێت لە هەر پارچەیەکی ئەم دنیایەدا، جا چ ئەمەریکا بێت، یان ئەوروپا؛ ئەوا کۆمەڵگا هەناسەیەکی بەبەردا دێت. کەواتە حیجاب لە ئاست و پێگەی ئافرەت کەم ناکاتەوە، بەڵکو ئاستی کۆمەڵایەتی ئافرەتان بەرزدەکاتەوە و، شەرمنی و پاکیزەیی ئافرەت دەپارێزێت.

# پرسیاری چوارەم
# ئایا ئیسلام بە زەبری شمشێر بڵاوبووەتەوە؟

**چۆن دەتوانرێت بە ئیسلام بوترێت (ئایینی ئاشتی)، لە کاتێکدا بە شمشێر بڵاوبووەتەوە؟**

## وەڵام/

ئەمە مشتومڕێکی باوە لەنێوان هەندێك لە ناموسوڵمانەکان، ئیسلام ملیۆنان لایەنگری نەدەبوو لە سەرتاسەری جیهاندا ئەگەر بەبەکارهێنانی هێز بڵاوبووبێتەوە، ئەم چەند خاڵەی خوارەوە زیاتر ڕوونی دەکاتەوە کە ئەوە هێزی زگماکی ڕاستی و عەقڵ و مەنتیق بووە؛ کە بەرپرسیار بووە لە بڵاوبوونەوەی ئیسلام بەشێوەیەکی زۆر کتوپڕ:

**١- ئیسلام بە مانای ئاشتی دێت:**

ئیسلام لە وشەی «السلام»ی عەرەبییەوە وەرگیراوە کە بە مانای «ئاشتی»دێت، هەروەها بە مانای خۆ بەدەستەوەدانی کەسێك دێت بۆ خوا، ئیسلام ئایینی ئاشتییە کە دەرکەوتووە لە ئەنجامی ملکەچبوون و خۆبەدەستەوەدانی کەسێك بۆ دروستکاری باڵا «خوا».

**٢- هەندێکجار دەبێت هێز بەکاربهێنرێت بۆ درێژەپێدانی ئاشتی:**

هەموو کەسێك لەم جیهانەدا پشتگیری لە ئاشتی و درێژەپێدانی دەکات،

هەندێکجار پێویستە هێز بەکاربهێنرێت بۆ درێژەدان بە ئاشتی و ئارامی، هەربۆیە هێزەکانی پۆلیس هێز بەکاردەهێنن لە بەرامبەر تاوانباران و هۆکارەکانی دژ بە کۆمەڵگا؛ بۆ بەرقەرار بوون و بەردەوامبوونی ئاشتییە لە وڵاتدا. لە هەمان کاتدا ئیسلام ڕێنمایی شوێنکەوتووانی دەکات بۆ ئەوەی بجەنگن لە هەر شوێنێك کە جەور و ستەم هەبێت، بەرەنگاربوونەوەی ستەم لە هەر کاتێکدا هەبێت ڕەنگە پێویستی بە هێز بێت، لە ئیسلامدا هێز تەنها بۆ بەرز ڕاگرتنی ئاشتی و دادپەروەری بەکاردێت.

## ٣- بیروڕای مێژوونووس دی لاس تۆلێری:

باشترین وەڵام بۆ ئەوەی کە ئیسلام بە شمشێر بڵاوبووەتەوە لەلایەن مێژوونووس (دی لاس تۆلێری)ەوە نـوسراوە، لە کتێبەکەیدا بە ناوی: «ئیسلام لە چوار ڕیاندا» لە لاپەڕە (٨)دا دەڵێت: «مێژوو ڕوونی دەکاتەوە کە ئەفسانەی دەمارگیریی موسوڵمانەکان کە ڕاماڵینەری جیهان بوون و، زۆرکردنی ئیسلام لە بەکارهێنانی شمشێر لەسەر نەتەوە داگیرکراوەکان؛ یەکێك بووە لە ئەفسانە زۆر دەمارگیرییەکان کە مێژوونوسان بۆ هەمیشە چەندبارەی دەکەنەوە.

## ٤-موسوڵمانەکان بۆ(٨٠٠ساڵ) فەرمانڕەوایی ئیسپانیایان کردووە:

موسوڵمانەکان بۆ ماوەی (٨٠٠ ساڵ) ئیسپانیایان بەڕێوەبرد، موسوڵمانەکان لە ئیسپانیا هەرگیز شمشێریان بەکارنەهێناوە، تاکو زۆر لە خەڵکی بکەن ئایینەکەیان بگۆڕن، دواتر مەسیحییە خاچپەرستەکان هاتن بۆ ئیسپانیا و

موسوڵمانەکانیان ڕاماڵی، تەنانەت یەك موسوڵمانیش لە ئیسپانیا نەبوو کە بەشێوەیەکی ئاشکرا بانگ بدات.

## ٥- (١٤٠) ملیۆن) عەرەب مەسیحی قیبتی بوون:

موسوڵمانەکان پاشای نیمچە دوورگەی عەرەبی بوون، بۆ چەند ساڵێکی کەم بەریتانییەکان فەرمانڕەوایەتییان کرد و، چەند ساڵێکیش فەڕەنسییەکان، بەڵام بە تێکڕا عەرەبەکان بۆ ماوەی (١٤٠٠ ساڵ) فەرمانڕەواییانکرد. تاکو ئەمڕۆش (١٤ ملیۆن) عەرەب هەن کە مەسیحی قیبتین. بەواتایەکی تر نەوەی مەسیحییەکانن. ئەگەر موسوڵمانەکان شمشێریان بەکاربهێنایە، ئەوا تەنها یەك عەرەب نەدەمایەوە کە مەسیحی بێت.

## ٦- زیاتر لە (٨٠٪)ی ناموسوڵمانەکانی هیندستان:

موسوڵمانەکان بۆ ماوەی (هەزار ساڵ) فەرمانڕەوایی هیندستانیان کردووە، ئەگەر بیانویستایە ئەوا هێزی ئەوەیان هەبوو کە هیندە ناموسوڵمانەکان بکەن بە موسوڵمان. ئەمڕۆ زیاتر لە (٨٠٪)ی دانیشتووانی هیندستان ناموسوڵمانن و، هەموو ئەو هیندە ناموسوڵمانانە ئەمڕۆ شایەتی بۆ ئەوە دەدەن کە ئیسلام بە شمشێر بڵاونەبووەتەوە.

## ٧- ئیندۆنیسیا و مالیزیا:

ئیندۆنیسیا وڵاتێکە کە زۆرترین ژمارەی موسوڵمانی لە هەموو جیهاندا تێدایە، زۆرینەی خەڵکی مالیزیا موسوڵمانن. ڕەنگە یەکێك پرسیار بکات و بپرسێت: «کام سوپایەی موسوڵمانان چوون بۆ ئیندۆنیسیا، یان مالیزیا تاکو

بیانکەن بە موسوڵمان؟»

## ٨- کەناری خۆرهەڵاتی ئەفریقا:

ئیسلام زۆر کتوپڕ لە کەنارەکانی خۆرهەڵاتی ئەفریقا بڵاوبووەوە، ڕەنگە یەکێك ئەو پرسیارە بکات: «ئەگەر ئیسلام بە زەبری شمشێر بڵاوبووبێتەوە چ سوپایەکی ئیسلام چووە بۆ کەنارەکانی خۆرهەڵاتی ئەفریقا؟»

## ٩- زۆر کردن نییە لە ئاییندا:

بە کام شمشێرە ئاینی ئیسلام بڵاوبووەوە؟ ئەگەر موسوڵمانەکانیش بیانویستایە نەیاندەتوانی، چونکە لە قورئاندا هاتووە خوای گەورە دەفەرموێت: (لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى لَا انْفِصَامَ لَهَا وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ) (البقرة: ٢٥٦). واتە: (لە دینی ئیسلامدا سەپاندن و ناچار کردن و زەبر و زەنگ نییە بۆ دینداری و وەرگرتنی ئاینی ئیسلام، چونکە ڕێگای چاك و ڕاست لە ڕێگای ناڕاست و کوفر و تولە ڕێگاکان لێك جیاکراونەتەوە و ئاشکرایە، ئینجا هەرکەسێك باوەڕی بە تاغوت نەبێت و باوەڕی بە خوا هێنا ئەوە بێگومان دەستی بە هەنگڵ و هۆکارێکی پتەو و قایمەوە گرتووە کە هەرگیز هەڵناوەشێتەوە و پچڕانیشی نییە خوای گەورەش بیسەر و زانایە).

## ١٠- شمشێری بیر و هۆش:

ئـەوە شمشێری بیر و هۆش بـوو، ئەو شمشێرەی کە دڵ و مێشکی

خەڵکەکانی داگیرکردووە، لە (سوورەتی النحل) لە قورئاندا هاتووە خوای گەورە دەفەرموێت: (ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ) (النحل: ١٢٥). واتە (ئەی پێغەمبەر! ئەی ئیمانداران! هەر بە ژیرانە و نەرم و قسەی خۆش و حیکمەت و ئامۆژگاری شیرین و جوان خەڵك بۆ ڕێگاری پەروەردگارت بانگ بکە، وە بە چاکترین و باشترین شێوە قسە و گفتوگۆیان لەگەڵ بکە، بەڵگەی جوان و بەهێزیان بۆ بهێنەوە، تۆ ئاوا موجادەلەیان لەگەڵ بکە بەڕاستی پەروەردگاریشت باشتر بە حاڵی ئەوانە دەزانێت کە لە رێی ئەو لایانداوە و زاناتریشە بە حاڵی ئەو کەسانە رێنوێنن و لەسەر رێی ڕاستن).

## ١١- ئاینی ئیسلام لە جیهاندا گەشە دەکات:

لە وتارێکی هەڵبژاردەی خوێنەرانی»ساڵنامە» لە ساڵی (١٩٨٦ز)دا، ئامارێکی بڵاوکردووەتەوە کە تێیدا ئاماری بەرزبوونەوەی ڕێژەی ئاینەکان لە جیهاندا لە نیو سەدەدا بڵاوکراوەتەوە لە نێوان ساڵەکانی (١٩٣٤ز) بۆ (١٩٨٤ز)، ئەم وتارە لە گۆڤاری **"the plain truth"** یشدا بڵاوبووەتەوە، لەسەروو هەموو ئاینەکانی ناو ئامارەکەدا ئاینی ئیسلام یەکەم بووە کە بە ڕێژەی(٢٣٥٪) و، ئاینی مەسیحی بە ڕێژەی (٤٧٪) زیادیکردووە، ڕەنگە کەسێك بپرسێت: «چ شەڕێك ڕووی داوە لەم سەدەیەدا تاکو چەندین ملیۆن خەڵك ببن بە موسوڵمان؟».

## ١٢- ئیسلام زۆرترین پەرەسەندنی لە ئەمەریکا و ئەورووپا هەیە:

ئەمڕۆ خێراترین ئایینی گەشەسەندوو لە ئەمەریکا و ئەورووپا ئایینی ئیسلامە. کام شمشێرە زۆر لەخەڵکی ڕۆژئاوا دەکات تا وا بکات بەو ژمارە زۆرە ئایینی ئیسلام قبوڵ بکەن؟

## ١٣- دکتۆر جۆزیف ئادەم پیەرسن:

دکتۆر جۆزیف ئادەم بە ڕاشکاوی دەڵێت: «ئەو خەڵکانەی کە نیگەرانن لەوەی ڕۆژێك چەکی ئەتۆمی دەکەوێتە دەست عەرەب، ئەوا هەڵەن لەوەی کە درك بەوە بکەن کە بۆمبی ئیسلامی دەمێکە تەقیوەتەوە، ئەو ڕۆژە ئەو بۆمبە کەوتە خوارەوە کە محەمەد لەدایکبوو».

# پرسیاری پێنجەم/ موسوڵمانەکان تیرۆریستن

## بۆچی زۆرینەی موسوڵمانەکان دەمارگیر و تیرۆریستن؟

**وەڵام/**

زۆرجار ئەم پرسیارە دەبێتە کۆسپ و ڕێگر لە بەردەم موسوڵمانەکاندا، جا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ؛ لە میانەی هەر گفتوگۆیەك لەسەر ئایین. موسوڵمانەکان چەندبارەی دەکەنەوە کە ئەمە جۆرێکە لە هەبوونی زانیاری خراپ و نادروست لەسەر ئیسلام و موسوڵمانەکان، لەڕاستیدا ئەم زانیارییە هەڵانە زۆرجار سەردەکێشێت بۆ جیابوونەوە و کرداری توندوتیژی دژ بە موسوڵمانەکان، بۆ نموونە هێرشێکی توندوتیژی دژ بە موسوڵمانەکان لەئەمەریکا لە ڕێگەی تەقینەوەی بۆمبێك؛ کە ڕاگەیاندنەکان بە خێرایی درکیان بەوە کرد کە ئەمە پیلانێکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستە و دەستی لەم هێرشەدا هەیە دواتر تاوانبارەکە دەرکەوت کە یەکێك بووە لە سەربازەکانی هێزی سەربازی ئەمریکا.

**ڕێگەم بدەن بە شرۆڤەکردنی بانگەشەی: «دەمارگیریی» و «تیرۆریزم»:**

### ١- پێناسەی وشەی «فەندەمێنتالیزم-دەمارگیریی»:

دەمارگیر کەسێکە کە شوێنکەوتە و وابەستەی بنچینەی ئەو مەزهەب، یان بیرۆکەیەیە کە بڕوای پێیەتی، بۆ کەسێك کە بیەوێت ببێت بە دکتۆرێکی باش؛ ئەوا پێویستە بزانێت و، شوێن زانستەکە بکەوێت و، بنچینەکانی پزیشکی جێبەجێ بکات. بە مانایەکی تر دەبێت دەمارگیربێت لەسەر

بواری پزیشکی. کەسێك کە بیەوێت ببێت بە بیرکاریزانێکی باش؛ ئەوا پێویستە دەمارگیربێت لەسەر بنچیینەکانی زانستی بیرکاری. بۆ کەسێك کە مەبەستی بێت ببێت بە زانایەکی باش؛ ئەوا پێویستە بنچینەکانی زانست بزانێت و، شوێنی بکەوێت و، جێبەجێی بکات، یان بە شێوەیەکی تر دەبێت دەمارگیربێت لەسەر ئامانجەکەی.

## ٢- هەموو «دەمارگیرەکان» چوونیەك نین:

هیچ کەسێك ناتوانێت هەموو دەمارگیرییەکان بەیەك فلچە وێنە بکێشێت، یاخود پۆلێنی بکات بەسەر باش و خراپدا، ئەو پۆلێنکردنە پشت دەبەستێت بەوجۆرە، یان ئەو چالاکییەی کە کەسەکان دەمارگیرن لەسەری. بۆ نموونە دەمارگیریی لەسەر دزی و تاڵانکردن دەبێتە هۆی زیان گەیاندن بە کۆمەڵگا و، بە کارێکی قێزەون تەماشا دەکرێت، بەڵام دکتۆری دەمارگیر سوودبەخش دەبێت بۆ کۆمەڵگا و ڕێزێکی زیاتری لێدەگیرێت.

## ٣- من شانازی دەکەم کە موسوڵمانێکی دەماگیربم:

من موسوڵمانێکی دەماگیرم بەشێوەیەك بنچینەکانی ئیسلام دەزانم و، شوێنکەوتەی ئایینەکەم و، بنچینەکانی جێبەجێ دەکەم، موسوڵمانی ڕاستەقینە شەرم لەوە ناکات لەوەی دەمارگیربێت، من شانازی دەکەم کە موسوڵمانێکی دەماگیربم؛ چونکە من دەزانم بنچینەکانی ئیسلام سوودبەخش و مرۆڤدۆستین، هیچ بنەمایەکی پێ لەسەرداگیراو نییە لە ئیسلامدا ببێتە هۆی ئازار و ژیان لەمرڤایەتی تێکبدات. زۆر خەڵك هەڵە تێگەیشتوون سەبارەت بە ئیسلام ،و چەندین شێوازی فێرکردن و

پێگەیاندنی موسوڵمانەکان بە هەڵەو ناڕاست دەزانن، ئەوەش بە هۆی هەبوونی زانیاری ناڕاست و ناگرنگ سەبارەت بە ئیسلام، ئەگەر کەسێك بەشێوەیەکی ڕەخنەگرانە بە مێشکێکی کراوە شێوازەکانی پێگەیاندنی تاکی موسوڵمان شیکار بکات، ئەوا هیچ کەسێك ناتوانێت لەو ڕاستییە هەڵبێت کە ئیسلام پڕە لە سوود بۆ تاك و کۆمەڵگا.

## ٤- مانای فەرهەنگیی بۆ وشەی «دەمارگیر»:

بەپێی فەرهەنگی **(Webster)** دەمارگیری بزووتنەوەیەکی پرۆتستانتی ئەمریکی بوو کە لە سەرەتاکانی سەدەی **(٢٠)** سەریهەڵداوە. ئەوەش پەرچەکردارێك بوو بۆ مۆدێرنیزم و جەختی لە نەبوونی هەڵە دەکردەوە لە ئینجیلدا، ئەمەش نەك تەنها لە بوارەکانی باوەڕ و ئەخلاق، بەڵکو وەك تۆمارێکی مێژوویی دەقاودەق و، جەختی لە بیروباوەڕی ئینجیل دەکردەوە وەکو وتەی دەقاودەقی خودا. بەمجۆرە وشەی **(فەندەمێنتالیزم-دەمارگیر)** لەبنەڕەتدا بەکارهێنراوە بۆ ئەم بزوتنەوەیە؛ کە گروپێکی مەسیحی بوون و بڕوایان وابوو کە وشە بە وشەی ئینجیل قسەی خودایە بە بێ هیچ هەڵە و کەمووکوڕییەك.

بەپێی فەرهەنگی **«Oxford»** فەندەمێنتالیزم بەمانای درێژەپێدان بە توندوتیژی لە مەزهەبی کۆن و بنچینەی هەر ئایینێکدا دێت، بە تایبەت ئایینی ئیسلام. ئەمڕۆ هەر کەسێك کە وشەی «فەندەمێنتالیزم-دەمارگیر» بەکاردێنێت وا بیردەکاتەوە کە ئیسلام تیرۆریست بێت.

## ٥- هەموو موسوڵمانێك پێویستە تیرۆریست بێت:

هەموو موسوڵمانێك پێویستە تیرۆریست بێت. کەسی تیرۆریستیش تۆقێنەرە. تیرۆریست کەسێکە کە ترس بەرهەم دێنێت، لەو ساتەی دزێك پۆلیسێك دەبینێت دەترسێت، لەو کاتەدا پۆلیسەکە تیرۆریستە و تۆقێنەرە بۆ دزەکە. هاوشێوەی ئەمە هەموو موسوڵمانێك پێویستە ترسێنەر بێت بۆ هۆکارەکانی دژ بە کۆمەڵگا، وەکو دز و، خراپەکار و، ئەو کەسانەی کە دەستدرێژی دەکەن، هەرکاتێك ئەو کەسە خراپانە موسوڵمانێك دەبینن پێویستە ترسیان هەبێت، ئەوە ڕاستییە کە وشەی «تیرۆریست» یان «تۆقێنەر» بەکادرێت بۆ کەسێك کە دەبێتە هۆکاری ترس لە ناو خەڵکدا، بەڵام موسوڵمانی ڕاستەقینە پێویستە تیرۆریست بێت بۆ چەند خەڵکێکی دیاریکراو، بە مانایەکی تر بۆ ئەو خەڵکانەی کە دژ بە کۆمەڵگان، نەك خەڵکانی سڤیل و بێ تاوان، لە ڕاستیدا موسوڵمان پێویستە سەرچاوەی ئاشتی و ئارامی بێت بۆ خەڵکی بێ تاوان.

## ٦- پێدانی ناونیشانی جودا بەهەمان کەس و هەمان ڕەفتار، بۆ نموونە (تیرۆریست) یان (نیشتمانپەروەر):

پێش ئەوەی هیندستان سەربەخۆیی بەدەستبهێنێت و، ڕزگاری بێت لە دەست بەریتانیا؛ هەندێك جەنگاوەرانی ئـازادی کە هیچ کارێکی توندوتیژییان ئەنجام نەدەدا، بەڵام لەلایەن حکومەتی بەریتانیاوە بە تیرۆریست لە قەڵەم دەدران، هەمان ئەو کەسانە لەلایەن هیندەکانەوە بە **«نیشتمانپەروەر»** لە قەڵەم دەدران. ئەم دوو ناونیشان و ناوهێنانە جیاوازانە دراونەتە پاڵ هەمان گروپ لە خەڵك، لە بەرامبەر هەمان ئەو

کارانەی کە ئەنجامیان دەدا، ئەوانەی کە پێیان وابوو کە بەریتانیا مافی ئەوەی هەیە هیندستان بەڕێوەببات بەو گروپە خەڵکەیان دەگوت: «تیرۆریست»، ئەوانەی کە پێیان وابوو بەریتانیا هیچ مافێکی نییە هیندستان بەڕێوەببات و فەرمانڕەوای خەڵکەکەی بکات بەو گروپە خەڵکەیان دەگوت: **«نیشتمانپەروەر»** و **«جەنگاوەرانی ئازادی»**. ئەوە زۆر گرنگە پێش ئەوەی کە بڕیار لەسەر کەسێك بدەیت پێویستە بە دادپەروەرانە لە هەردوو ڕووەکەوە گوێی لێ بگریت، دەبێت بارودۆخەکە شرۆڤە بکرێت، دەبێت هۆکارەکان لەبەرچاو بگیرێت. دوای هەموو ئەمانە ئینجا دەبێت بڕیار لەسەر کەسەکە بدەیت.

## ٧-ئیسلام بە مانای ئاشتی دێت:

ئیسلام لەوشەی «السلام»ەوە وەرگیراوە کە بە مانای «ئاشتی» دێت. دەمارگیرەکان شوێنکەوتووانیان دادپەروەر دەکەن کە لە سەرتاسەری جیهاندا درێژەپێدەری ئاشتی بن. بۆیە دەبێت هەموو موسوڵمانێك دەمارگیربێت بۆ ئەوەی شوێن بنچینەکانی ئایینی ئاشتی بکەون و جێبەجێی بکەن، لەگەڵ ئەمەشدا پێویستە تیرۆریست بێت لە بەرامبەر ئامرازەکانی دژ بە کۆمەڵگا؛ بۆ ئەوەی ئاشتی و ئارامی لە کۆمەڵگادا بەرقەرار بێت.

# پرسیاری شەشەم
# خواردنە گۆشتییەکان یاخود ناڕووەکییەکان

## بۆچی موسوڵمانان خواردنە گۆشتییەکان بەکاردەهێنن و بەشێوەیەکی دڕندانە ئاژەڵەکان دەکوژن؟

## وەڵام/

«ڕووەکییەکان» لە ئێستادا بزووتنەیەکی جیهانین، تەنانەت هەندێکیشیان هاوڕان لەسەر پاراستنی مافەکانی ئاژەڵ، لە ڕاستیدا ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی وا بیردەکەنەوە کە بەکارهێنانی گۆشت و خواردنە ناڕووەکییەکانی تر توندوتیژییە لە هەمبەر بە مافەکانی ئاژەڵ، ئیسلام بەزەیی هەیە بۆ هەموو زیندەوەرێکی زیندوو، لە هەمان کاتدا ئیسلام درێژە بەوە دەدات کە خوا زەوی بە هەموو ڕووەك و ئاژەڵەکانیەوە بۆ قازانجی مرۆڤایەتی دروستکردووە، ئەوە دەکەوێتە سەر مرۆڤەکان کە هەموو سەرچاوەکان بە کاربهێنێت یان نا.

با تەماشایەکی لایەنە جیاوازەکانی ئەم گفتوگۆیە بکەین.

### ١- موسوڵمان دەتوانێت ڕووەکی بێت:

موسوڵمان دەتوانێت موسوڵمانێکی باش بێت، لەگەڵ ئەوەی کە ڕووەکخۆریش بێت، بە زۆر نییە کە مرۆڤی موسوڵمان خواردنە ناڕووەکییەکان بخوات.

## ٢- قورئان ڕێگە دەدات بە موسوڵمانان کە خواردنە ناڕووەکییەکان بەکاربهێنێت:

قورئان هەرچەندە کە ڕێگە بە موسوڵمان دەدات کە خواردنە ناڕووەکییەکان بخوات، ئەوا ئەم چەند ئایەتەی خوارەوە ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێت:

* (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ أُحِلَّتْ لَكُمْ بَهِيمَةُ الْأَنْعَامِ إِلَّا مَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ غَيْرَ مُحِلِّي الصَّيْدِ وَأَنْتُمْ حُرُمٌ إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ) (المائدة:١). واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە گشت پەیمانێك جێبەجێ بکەن و لە ئەنجامدانیدا بە ئەمەك و بەوەفا بن، خواردنی گۆشتی وشتر و گا و مەڕ و بزن دوای سەربڕینیان حەڵاڵ کراوە بۆتان و هەروەها بەچکەی هەرکامێکیشیان، ئەو پەلەوەر و ئاژەڵانە نەبێت «کە لەم سوورەتدا بۆتان دەخوێندرێتەوە لە ئایەتی (حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ)دا»، بەڵام تا لە ئیحرامدابن ڕاوکردن بە ڕەوا دامەنێن، بە ڕاستی خواش هەرچۆنێکی ویست بڕیاردەدات).

* (وَالْأَنْعَامَ خَلَقَهَا لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَافِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ) (النحل: ٥). واتە: (مەڕ و بزن و گاو وشتریشی بۆ درووستکردوون کە هۆی گەرمیان تێدایە بۆتان بێجگە لەوەش گەلێك سوود و کەڵکی تریان تێدایە بۆتان «شیر و دۆ و ڕۆن و پەنیر ....هتد» و لە گۆشتەکانیشیان دەخۆن)

* {وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُسْقِيكُمْ مِمَّا فِي بُطُونِهَا وَلَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ} (المؤمنون: ٢١). واتە: (بەڕاستی لە بەدیهێنانی مەڕ و بزن و گا و وشتردا پەندی فراوان و زۆرتان بۆ هەیە، وە ئەوەی لە ناو سکیاندایە پێیان دەنۆشین، بەهرە و کەڵکی تری زۆریان هەیە بۆتان و لێشیان دەخۆن وە لەسەر پشتی هەندێ لەو ئاژەڵانە و لەسەر کەشتیەکان هەڵئەگیرێن و

ئەگوازرێنەوە).

## ٣- گۆشت خۆراکپێدەر و دەوڵەمەندە بە پڕۆتینی تەواو:

خواردنە نارووەکییەکان سەرچاوەیەکی زۆر باشی پڕۆتینن، لە ڕووی بایۆلۆجییەوە تەواو پڕن لە پڕۆتین، بەشێوەیەکی تر هەر هەشت جۆرە ترشە ئەمینییە سەرەکییەکانی تێدایە، لەگەڵ ئەوەشدا گۆشت ئاسن و ڤیتامین B١ و ئەو ڤیتامینانەی تێدایە کە پێویستن بۆ تەندروستی کۆئەندامی دەمار و کۆئەندامی هەرس.

## ٤- مرۆڤەکان ددانەکانیان هەردوو شێوەی گۆشتخۆرو ڕووەکخۆری تێدایە:

ئەگەر تەماشای ددانی ئاژەڵە گیاخۆرەکانی وەکو مانگا و بزن و مەڕ بکەین شتێکی سەرنجڕاکێش دەبینیت لە ددانی هەموویاندا. هەموو ئەو ئاژەڵانە ژمارەیەك ددانی ڕێکیان هەیە کە گونجاوە بۆ ڕووەکخواردن و، ئەگەر تەماشای ددانی گۆشتخۆرەکانی وەکو شێر و پڵنگ بکەین ددانی تیژیان هەیە، بەشێوەیەك کە گونجاوە بۆ گۆشتخۆرەکان ئەگەر بێتو شیکارییەك بۆ ددانی مرۆڤ بکەین دەبینیت کە مرۆڤ ددانی تەخت و ددانی تیژیشی هەیە بۆ هەردوو جۆرەکە کە ڕووەکخۆر و گۆشتخۆرە، دەشێت و گونجاوە. ڕەنگە کەسێك پرسیاری ئەوە بکات کە ئەگەر خوا بیویستایە مرۆڤەکان تەنها ڕووەکخۆر بن ئەی بۆچی ددانی تیژیشی پێ بەخشیوە؟ ئەوە لۆژیکییە کە خوای گەورە پێشبینی ئەوەی کردووە کە لە هەمان کاتدا پێویستمان بە ڕووەك و بە گۆشتیش دەبێت.

## ٥- مرۆڤەکان لە توانایاندایە ڕووەك و گۆشتیش باش هەرس بکەن:

کۆئەندامی هەرسی ڕووەکخۆرەکان تەنها خواردنە ڕووەکییەکان هەرس دەکات، لە هەمان کاتدا کۆئەندامی هەرسی گۆشتخۆرەکان تەنها خواردنە گۆشتییەکان هەرس دەکات، بەڵام کۆئەندامی هەرسی مرۆڤ هەردوو جۆرەکە بەباشی هەرس دەکات. کەواتە دەپرسین ئایا ئەگەر خوا بیویستایە تەنها ڕووەکخۆر بین، ئەوا بۆچی کۆئەندامێکی هەرسی وای پێ دەبەخشین کە خۆراکە ناڕووەکییەکانیش هەرس بکات؟

## ٦- کتێبی پیرۆزی هیندۆسەکان ڕێگە بە خواردنی ناڕووەکییەکان دەدات:

**یەکەم:** زۆرێك لە هندۆسەکان زۆر بەتوندی ڕووەکخۆرن وا هەست دەکەن کە دژ بە ئایینەکەیانە کە خواردنە ناڕووەکییەکان بەکاردەهێنن، بەڵام ڕاستییەکی دیارە کە کتێبی پیرۆزی هندۆسەکان ڕێگە بە مرۆڤ دەدات کە گۆشتیش بخۆن.

**دووەم:** لە کتێبی یاسای هندۆسەکاندا کە ناوی «هانو سمورتی»ە، لە زنجیرەی (**٥ بەشی ٣٠**)دا باسکراوە، نوسراوە: «ئەو کەسانەی کە گۆشت دەخۆن هیچ کارێکی خراپ ناکەن، هەرچەندە ئەگەر هەموو ڕۆژێك لە دوای یەك گۆشت بخۆن، خودا خۆی هەندێك شتی دروستکردووە بخورێت و هەندێك کەسیش کە بیانخوات».

**سێیەم:** جارێکی تر لە بەشێکی تری هەمان کتێبی پێشوودا هاتووە دەڵێت: «خواردنی گۆشت بۆ قوربانی گونجاوە، ئەمەش وەکو نەریتێك بە ڕۆڵی خواوەندەکان ناسراوە».

**چوارەم:** لە زنجیرەی **(٥ی بەشی ٣٩ و ٤٠)ی** هەمان کتێبدا هاتووە: «خوا خۆی هەندێك ئاژەڵی درووستکردووە بۆ قوربانی، کەواتە گۆشت بەمەبەستی قوربانی کوشتن نییە»

## ٧- کاریگەری ئایینەکانی تر لەسەر ئایینی هندۆس:

هەرچەندە کتێبی پیرۆزی هندۆسەکان ڕێگە بە شوێنکەوتووانی دەدات کە خواردنی ناڕووەکییەکان بخۆن، بەڵام زۆر لە هندۆسەکان خواردنە ڕووەکییەکان پەسەند دەکەن، چونکە کاریگەربوون بە ئایینی تری وەکو «جەینیزم» کە ئایینێکی هندییە لە **(سەدەی ٦)ی** پێش زایین پەیدابووە.

## ٨- تەنانەت ڕووەکەکانیش زیندوون و ژیانیان هەیە:

چەند ئایینێکی دیار سیستمی خۆراکی ڕەها پیادە دەکەن و، تەنها ڕووەك وەکو سەرچاوەی خواردنیان بەکاردەبەن، چونکە ئەوان بە تەواوی دژی کوشتنی زیندەوەری زیندوون. ئەگەر کەسێك بتوانێت بمێنێتەوە بە بێ کوشتنی هیچ بوونەوەرێکی زیندوو، من یەکەم کەس دەبم ئەو ڕێچکەی خۆراکە دەگرمەبەر. لەپێشدا مرۆڤ وای بیردەکردەوە کە ڕووەکەکان بێ گیانن، ئەمڕۆ ڕاستییەکی گەردوونییە کە تەنانەت ڕووەکەکانیش ژیانیان هەیە و گیانلەبەرن. کەواتە لۆژیکی ئاوها بە کوشتنی زیندەوەرانی زیندوو

تەواو نییە؛ تەنانەت بە بوون بە ڕووەکخۆرێکی تەواویش.

## ٩- تەنانەت ڕووەکیش هەست بە ئازار دەکات:

ئەوان زیاتر گفتوگۆ دەکەن سەبارەت بەوەی کە ڕووەك هەست بە ئازار ناکات، ئەمڕۆ زانست ئەوەمان پێدەڵێت کە تەنانەت ڕووەکیش هەست بە ئازار دەکات، بەڵام ناتوانرێت گریانی لەلایەن مرۆڤەکانەوە ڕووەك ببیسترێت، ئەوەش بەهۆی ئەوەی کە **گوێی مرۆڤ** دەتوانێت لە نێوان **(٢٠ هێرتز بۆ ٢٠٠٠٠ هێرتز)** ببیستێت. هەر دەنگێك لەو ڕێژەیە نزمتر یان بەرزتر لەلایەن مرۆڤەوە ناتوانرێت ببیسترێت، سەگ دەتوانێت تاکو **(٤٠٠٠٠ هێرتز)** ببیستێت، هەرچەندە فیکەیەکی بێ دەنگی سەگ هەیە کە تەنها گوێی سەگ توانای بیستنی ئەو دەنگەی هەیە، سەگ دەنگی فیکەی خاوەنەکەی دەبیستێت و دێت بۆ لای. لێکۆڵینەوەیەك هەیە کە لە ئەمەریکا لەلایەن جوتیارێکەوە ئەنجامدراوە کە ئامێرێکی داهێناوە کە دەنگی گریانی ڕووەك دەگۆڕێت بۆ دەنگێك کە لەلایەن مرۆڤەوە دەتوانرێت ببیسترێت. لە دواهەمین لێکۆڵینەوەدا ئەوە دەردەخات کە ڕووەکەکان دەتوانن هەست بە دڵ خۆشی و دڵ تەنگی بکەن/ هەروەها دەشتوانن بگرین.

## ١٠- کوشتنی زیندەوەرێکی زیندوو کە دوو هەستی هەبێت تاوانێکی بچووك نییە:

یەکێك لە ڕووەکخۆرەکان گفتوگۆی ئەوە دەکات کە ڕووەك تەنها دوو یان سێ هەستی هەیە، لە کاتێکدا ئاژەڵ پێنج هەستی هەیە، کەواتە کوشتنی

ڕووەکێك تاوانێکی کەمترە لە کوشتنی ئاژەڵێك. وادابنێ براکەت بە کەڕوڵاڵی لەدایکبووە؛ ئەوا بەبەراورد بە کەسانی تر دوو هەستی کەمترە، کەسێکیش دەیکوژێت، ئایا تۆ داوا لە دادوەر دەکەیت کە سزایەکی کەمتر بدات بەسەر بکوژەکەدا، لەبەر ئەوەی کە براکەت دوو هەستی کەمتر بووە؟ لە ڕاستیدا دەبێت داوای سزایەکی گەورەتر بکەیت، چونکە کەسێکی بێ تاوانی کوشتووە، لە قورئاندا هاتووە خوای گەورە دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا النَّاسُ كُلُوا مِمَّا فِي الْأَرْضِ حَلَالًا طَيِّبًا وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ} (البقرة: ١٦٨) **واتە: (ئەی خەڵکینە! لە ڕزق و ڕۆزیی سەرزەمین حەڵاڵێکی پاك بخۆن، هەرگیز بە شوێن هەنگاوەکانی شەیتاندا مەڕۆن و پەیڕەوی لێمەکەن، ئەو دوژمنێکی ئاشکراتانە).**

## ١١- زیادبوونی ژمارەی ئاژەڵ:

ئەگەر هەموو مرۆڤەکان ببن بە ڕووەکخۆر ئەوا ڕێژەی ژمارەی ئاژەڵ لە جیهاندا زیاد دەکات، چونکە زیادبوونی ژمارەی ئاژەڵەکان زۆر خێرایە، یاخود بەو هەموو واتایەی خۆیەوە زۆرباش دەزانێت چۆن درێژە بە هاوسەنگی ژیان بدات.

## ١٢- نرخی گۆشت گونجاوە لەکاتێکد هەموو ناڕووەکی نین:

گرنگ نییە ئەگەر هەندێك خەڵك ڕووەکــی بن، هەرچەندە ئەوان ناڕووەکییەکان بە توندوتیژیی تاوانبار دەکەن، لە ڕاستیدا ئەگەر هەموو هیندەکان ببن بە ناڕووەکی ئەوا ناڕووەکییەکانی ئێستا دەبن بە دۆڕاو و، نرخی گۆشتیش بەرز دەبێتەوە.

# پرسیاری حەوتەم

## شێوازی موسوڵمانان لەسەربڕینی ئاژەڵەکان درندانە دەردەکەوێت

**بۆچی موسوڵمانان ئاژەڵ سەردەبڕن بەشێوەیەکی درندانە و، بە ئازاردان و کوشتنێکی لەسەرخۆ و بە ئازار؟**

## وەڵام/

ڕێبازی ئیسلامی لەسەربڕینی ئاژەڵدا بە **«زەبح»** ناسراوە، کە بووە بەبابەتی زۆربەی ڕەخنەگرەکان. پێش ئەوەی وەڵام بدەمەوە ڕێگە بدەن ئەم بابەتە ببەستمەوە بە وتوێژی نێوان موسوڵمانو نامسوڵمانێکەوە، جارێکیان نامسوڵمانێك پرسیاری لە موسوڵمانێك کرد و لێی پرسی:»بۆچی ئێوە ئاژەڵ بە شێوەیەکی ئازاردار سەردەبڕن؟ ئەویش لەڕێی بڕینی قوڕگیانەوە؟» موسوڵمانەکەش وەڵامی دایەوە، وتی: **«ئێمە بوێر و ئازاین و لە پێشەوە هێرش دەبەین، ئێمە شانازی بە پیاوەتی خۆمانەوە دەکەین، ئێوە ترسنۆکن لە پشتەوە هێرش دەبەن».** ئەمە تەنها بۆ نوکتە، بەڵام ئەگەر کەسێك ئەم چەند خاڵانەی خوارەوە ڕەچاو بکات کە سەلمێنراوە شێوازی سەربڕین نەك تەنها مرۆڤانەیە، بەڵکو لە ڕووی زانستیشەوە باشترینە:

### ١- شێوازی ئیسلامییانە بۆ سەربڕینی ئاژەڵ:

شێوەی سەربڕینی ئاژەڵ لە شێوازی ئیسلامیدا پێویستە ئەم خاڵانە ڕەچاو

بکرێت و لە پرۆسەی سەربڕینەکەدا جێبەجێ بکرێت.

**یەکەم:** پێویستە ئاژەڵ بە شتێکی تیژی وەکو چەقۆ سەرببڕێت.

پێویستە ئاژەڵەکە بە کەرەستەیەکی تیژی وەك چەقۆ، یان هەر شتێکی تر سەرببڕرێت، بەڵام دەبێت تیژ بێت و بەخێرایی بێت، بۆ ئەوەی ئازاری ئاژەڵەکە کەمتر بێت.

**دووەم:** دەبێت بۆری هەوا و قوڕگ و دەماری مل ببڕێت:

(زەبح) وشەیەکی عەرەبییە بە مانای «سەربڕین»دێت، کرداری سەربڕینەکە دەبێت لە ڕێگەی بڕینی قوڕگ و بۆری هەوا و دەماری خوێنی ملی ئاژەڵ بێت، بە بێ بڕینی دڕکەپەتك.

**سێیەم:** پێویستە خوێنی ئاژەڵەکە بێتە دەرەوە .

پێویستە خوێنەکە بە تەواوی بێتە دەرەوە پێش ئەوەی سەری ئاژەڵەکە بە تەواوی لێ بکرێتەوە، مەبەست لەمەش دەرچوونی تەواوی خوێنی ئاژەڵەکەیە کە هاوکارێکی باشە بۆ گەشەسەندنی زیندەوەری بچووك تیایدا. نابێت دڕکەپەتك ببڕدرێت، چونکە ڕیشاڵی دەماری دڵ دەپچڕێت لەگەڵیدا، چونکە دەبێتە هۆی وەستانی ناردنی فەرمان بۆ دڵ، تاکو هەموو خوێنەکە لە جەستەی بێتە دەرەوە.

## ٢- خوێن نێوەندێکی باشە بۆ بەکتریا و میکرۆب:

خوێن نێوەندێکی باشە بۆ بەکتریا و میکرۆب و ژەهراوییبوون و ...هتد، دواتر شێوازی موسوڵمانان لە سەربڕیندا دروستترینە و خاوێنترینە لە تێکەوتنی بەکتریا و میکرۆب بۆ ناو خوێنەکە، کە هۆکارن بۆ زۆر نەخۆشی.

### ٣- گۆشتەکە بۆ ماوەیەکی زۆرتر بە تازەیی دەمێنێتەوە:

ئاژەڵێك بەشێوازی ئیسلامی سەربڕدرابێت گۆشتەکەی بۆ ماوەیەکی زیاتر بە تازەیی دەمێنێتەوە، ئەوەش بەهۆی کەمیی خوێنە لە گۆشتەکەدا بە بەراورد بەشێوازەکانی تری سەربڕین.

### ٤- ئاژەڵ هەست بە ئازار ناکات:

خێرا سەربڕینی دەمارەکانی مل پەیوەندی نێوان لێشاوی خوێن بۆ دەمارەکانی مێشك دەپچڕێنێت، کە لێپرسراوە لە ئـازار، بەو هۆیەوە ئاژەڵ هەست بە ئازار ناکات، لەکاتی مردندا ئاژەڵەکە هەوڵدەدات و دەلەرزێت و پەل دەهاوێژێت، نەك بەهۆی بوونی ئازارەوە؛ بەڵکو بەهۆی چوونەوەیەك و خاوبوونەوەی ماسوولکەکانی و، بە لێشاو هاتنەدەرەوەی خوێن لە جەستەیدا.

# پرسیاری هەشتەم

## خواردنە نارووەکییەکان وا لە موسوڵمان دەکات توندوتیژ بێت

**زانست ئەوەمان پێدەڵێت ئەوەی کە کەسێك دەیخوات کاریگەری دەخاتە سەر ڕەفتاری. باشە بۆ ئیسلام ڕێگە بە موسوڵمانان دەدات کە خواردنە نا ڕووەکییەکان بخۆن، کە ڕەنگە خواردنی گۆشت وا لە مرۆڤ بکات توندوتیژ بێت؟**

## وەڵام/

### ١- تەنها خواردنی ئاژەڵی گیاخۆر ڕێگەپێدراوە:

من هاوڕام لەگەڵ ئەوەی مرۆڤەکان چی بخۆن کاریگەری دەبێت لەسەر ڕەفتار و هەڵسوکەوتیان، ئەمەش یەکێکە لەو هۆکارانەی کە ئیسلام ڕێگەی گرتووە لە خواردنی گۆشتی ئاژەڵی گۆشتخۆری وەکو شێر و پڵنگ و ...هتد کە دڕندەن. بەکارهێنانی گۆشتی ئەم ئاژەڵانە بە دڵنیاییەوە دەبێتە هۆی ئەوەی وا لە مرۆڤ بکات کە توووند بێت. ئیسلام تەنها ڕێگە بە گۆشتی ئاژەڵی گیاخۆری وەکو مانگا و بزن و مەڕ و ...هتد دەدات کە ئاژەڵێکی بێ زیانن. ئێمەی موسوڵمان تەنها گۆشتی ئاژەڵی هێمن و بێ زیان دەخۆین، لەبەر ئەوەی کەسانی ئاشتییخوازین و ئاشتیمان خۆشدەوێت.

## ٢- قورئان دەفەرموێت پێغەمبەر ئەوانە قەدەغە دەکات کە خراپن:

* {الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنْزِلَ مَعَهُ أُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ} (الأعراف: ١٥٧). واتە: (ئیمانداری کامڵ ئەوانەن دەکەونە شوێن ئەو پەیامدەر و هەوڵدەرەی خوا کە نەخوێندەوارە «هیچی نەخوێندووە و نەنوسیوە» ئەو پێغەمبەرەی کە ناو و سیفەتەکانی لە تەورات و ئینجیلدا نوسراوە، فەرمانیان بەچاکە پێدەکات و لەشتی خراپ و ناپەسەند ڕێگەیان لێدەگرێت و هەموو شتێکی پاك و خاوێنیان بۆ حەڵاڵ دەکا و هەموو شتێکی خراپ و زیانبەخشیان لێ حەرام دەکات، وەکو شەراب و گۆشتی بەراز و ریبا ...هتد. وە بار و تەکلیفی قورس و کۆت و زنجیری لەسەریان شەتەك درابوو لای دەبا، ئینجا ئەوانەی بڕوایان بەو پەیامبەرە هێنا و بەڕێز و حورمەتەوە ڕایان گرت و هاوکاری و پشتگیریان لێکرد بە جیهاد و تێکۆشان دوای ئەو ڕووناکییەش کەوتن لەگەڵیا نێردراوە، ئەو خەڵکانە ئەمانە سیفەتیان بن بەختیار و سەرفرازن).

بۆ موسوڵمانان فەرموودەکانی پێغەمبەر بەسە وەکو بەڵگەیەك کە خوای گەورە ڕێگەی داوە هەندێك جۆر گۆشت بخوات و هەندێك نەخوات.

٣- لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (د.خ) هاتووە کە خواردنی ئاژەڵە گۆشتخۆرەکان ڕێگەپێنەدراوە، بە گوێرەی چەند فەرموودەیەکی سەحیحی

بوخاری و مسلم و ئەو فەرموودانەی کە لەلایەن (ابـن عباس)ەوە گێڕدراوەتەوە. لە (صحیح مسلم)دا لە لیستی: «ڕاوکردن و سەربڕین» فەرموودەی ژمارە (٤٧٥٢) و، کتێبی (سنن)ی ابن الماجە، (بەشی ١٣) فەرموودەی (٣٢٣٢ بۆ ٣٢٣٤)دا هاتووە کە پێغەمبەر (د.خ) خواردنی ئەمانەی خوارەوەی قەدەغەکردووە:

**یەکەم:** ئاژەڵی کێوی، ئەوانەیان کە کەڵبەیان هەیە. بە مانایەکی تر ئاژەڵە گۆشتخۆرەکان، لەوانە ئەو ئاژەڵانەی کە سەر بە پۆلی پشیلەن وەکو شێر، پڵنگ، پشیلە، سەگ، گورگ، کەمتیار ...هتد.

**دووەم:** کرتێنەرەکان، وەکو مشك و جرج و کەروێشکی چڕنوکدار ...هتد.

**سێیەم:** خشۆکەکانی، وەکو مار و تیمساح... هتد.

**چوارەم:** باڵندەی ڕاوچی کە چڕنوکیان هەیە، وەکو هەڵۆ، باز، قەلەڕەش، کوندەپەپوو ...هتد.

# پرسیاری نۆیەم
# موسوڵمانەکان کەعبە دەپەرستن

**لە کاتێکدا ئیسلام دژی بت پەرستییە، بۆچی موسوڵمانەکان کەعبە دەپەرستن و بۆی دەچەمێنەوە لەکاتی نوێژەکانیاندا؟**

## وەڵام/

کەعبە قیبلەیە. ئەو شوێنەیە کە موسوڵمانان لە کاتی نوێژکردندا ڕووی تێدەکەن، ئەوە زۆر گرنگە کە تێبینی ئەوە بکەین کە موسوڵمانان کەعبە ناپەرستن، موسوڵمانان بێجگە لە خوای گەورە بۆ هیچ کەسێکی تر ناچەمێننەوە، وەکو ئەوەی کە لە سوورەتی (البقرة)دا خوای گەورە دەفەرموێت: {قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنْتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ وَإِنَّ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّهِمْ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ} (البقره: ١٤٤). واتە: (بێشك دیتمانی ئەی پێغەمبەر کە بەرەو ئاسمان چاو دەگێڕیت و دەڕوانی و پێت خۆشە ڕوو بکەیتە قیبلە، دەسا دڵنیابە ئێمە لە نوێژەکاندا ڕووت بەرەو ڕووگەیەك وەردەگێڕین کە خۆت پێت خۆشە، ڕووت بەرەو مزگەوتی حەرام وەربگێڕە، وە ئێوەش ئەی ئیمانداران لە هەر کوێ بن دەبێت ڕوو بکەنە مزگەوتی حەرام، وە بەڕاستی ئەوانەش وا نامەی ئاسمانیان پێدراوە چاك دەزانن ئەو گۆڕانکاریە فەرمانێکی حەق

و ڕاسته لەلایەن پەروەردگاریانەوە، خواش لەو چاو و ڕا و پڕوپاگەندەیە سەبارەت بەو گۆڕانکاریە کردیان بێ ئاگا نیە و تۆڵەیان لێدەستێنێت).

### ١- ئیسلام بڕوای بە یەکێتی هەیە:

بۆ نموونە ئەگەر موسوڵمانان ویستیان نوێژ بکەن، ئەوا گونجاوە ئەگەر هەندێکیان ڕووبکەنە باکوور و هەندێکیان ڕوو بکەنە باشوور بۆ ئەوەی یەکگرتوو بن لە پەرستنی خوای ڕاستەقینە، موسوڵمانەکان لە هەر شوێنێك بن داوای ئەوەیان لێدەکرێت کە ڕووبکەنە یەك ئاڕاستە ئەویش ڕووگەی کەعبەیە.

### ٢- کەعبە چەقی گەردوونە:

موسوڵمانەکان یەکەم کەس بوون کە نەخشەی جیهانیان کێشاوە، ئەوان نەخشەکەیان لە باکوورەوە بەرەو باشوور کێشاوە و، بینویانە کە کەعبە لە چەقدا بووە. دواتر لە خۆرهەڵاتەوە بەرەو ڕۆژئاوا کێشاویانە بینویانە کە کەعبە لە چەقدا بووە. سوپاس بۆ خوا کە کەعبە لە سەنتەری نەخشەی جیهاندایە.

### ٣- سووڕانەوە بە دەوری کەعبەدا بۆ دەرخستنی خوای گەورە:

کاتێك موسوڵمانەکان دەگەنە (المسجد الحرام) لە مەککە تەواف بە دەوری کەعبەدا ئەنجام دەدەن، ئەم کردارە سمبوڵی بڕوابوون و پەرستنی یەك خوایە، هەروەك ئەوەی کە هەموو بازنەیەك چەقی هەیە، کەواتە هەروەها

تەنها یەك خوا هەیە کە شایەنی پەرستنە.

## ٤- فەرموودەی عومەر (خوا لێی ڕازی بێت):

سەبارەت بە بەردە ڕەشەکە (حجر الاسـود)، فەرموودەیەك هەیە کە دراوەتە پاڵ یەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر (د.خ)، کە ئەویش عومەری کوڕی خەتتابە. بە پێی صحیح بوخاری بەگی دووەم، لە کتێبی حەج، بەشی (٥٦)، لە فەرموودەی ژمارە (٦٧٥)دا، حەزرەتی عومەر دەفەرموێت: «من دەزانم تۆ بەردیت و نە سوودت هەیە نەزیان. ئەگەر نەمدیبایە کە پێغەمبەر (د.خ) دەستت لێبدات یان ماچت بکات، ئەوا منیش هەرگیز دەستم لێ نەدەدایت و ماچم نەدەکردیت».

## ٥- خەڵکی دەوەستان و لەلای کەعبەدا بانگیان دەدا

لەسەردەمی پێغەمبەردا (د.خ) خەڵکی لەلای کەعبە وەستاون و بانگیان داوە، یاخود خەڵکییان بانگ کردووە بۆ نوێژ. ڕەنگە کەسێك لەو کەسانەی کە واگومان دەبەن کە مسوڵمانەکان کەعبە دەپەرست هاوکات ئەم پرسیارەش لەخۆی بکات: کام بتپەرست لەسەر سەری ئەو بتە دەوەستێت کە خۆی دەیپەرستێت؟ (واتە: ئەگەر مسوڵمانەکان کەعبە وەك بتێك بپەرستن، چۆن دەبێت بەپێوە بچنە سەر کەعبە و بانگ بدەن؟).

# پرسیاری دەیەم

**ناموسوڵمانەکان ڕێگەیان پێ نادرێت بچنە ناو مەککە و مەدینە:**

**بۆچی ناموسوڵمانەکان ڕێگەیان پێ نادرێت بچنە ناو شارە پیرۆزەکانی وەکو مەککە و مەدینەوە؟**

## وەڵام/

ئەوە ڕاستە کە ناموسوڵمانەکان ڕێگەیان پێ نادرێت بچنە ناو شارە پیرۆزەکانی وەکو مەککە و مەدینە؛ ئەویش لە ڕێگەی یاساوە. ئەم خاڵانەی خوارەوە هۆکاری گونجاو ڕوون دەکاتەوە:

١- هەموو هاوڵاتییەك ڕێگەی پێنادرێت کە بچنە ناو سەربازگە لەکاتێکیشدا من هاوڵاتییەکی هیندیم، من ڕێگەم پێ نادرێت بچمە هەندێك ناوچەی دیاریکراوەوە وەك سەربازگەکان. لە هەموو وڵاتێك چەند شوێنێکی دیاریکراو هەیە کە هاوڵاتی سادە ناتوانن بچنە ناویەوە، تەنها ڕێگە بەو کەسانە دەدرێت کە لە سوپادان، یان ئەوانەی کە لە بەرگریدان بچنە ئەو شوێنە، هاوشێوەی ئەوە؛ ئیسلام ئایینێکی گەردوونییە بۆ تەواوی دونیا و هەموو مرۆڤایەتی، سەربازگەی موسوڵمانان ئەو دوو شارە پیرۆزەن (مەککە و مەدینە) تەنها ئەوانەی کە بڕوایان بە ئیسلام هەیە، یان ئەوانەی کە بەرگری لە ئاینی ئیسلام دەکەن دەتوانن بچنە ناوی. ئەوە نامەنتقییە بۆ

کەسانی ئاسایی تا بووەستنەوە لە دژی چوونە ناو سەربازگەوە. بە هەمان شێوە کەسانی ناموسوڵمان بۆیان نییە لە دژی چوونە ناو مەککە و مەدینە بوەستنەوە.

## ٢-ڤیزا بۆ چوونە ناو مەککە و مەدینە:

**یەکەم:** هەر کاتێك کەسێك گەشت بکات بۆ وڵاتێکی بێگانە، ئەوا پێویستە سەرەتا داوای ڤیزا بکات. بە مانایەکی تر دەبێت مۆڵەتی چوونە ناو ئەو وڵاتە وەربگرێت، هەموو وڵاتێك یاسای خۆی هەیە و داوای ڤیزا دەکات بۆ داخڵبوونی.

**دووەم:** یەکێك لەو وڵاتانەی کە زۆر توندە لە دەرکردنی ڤیزا ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە، ئەوان زۆر مەرج و داواکارییان هەیە دەبێت پێشکەشی بکەیت تاکو ڤیزای ئەو وڵاتەت دەدەنێ.

**سێیەم:** کاتێك کە سەردانی سەنگافورام کرد، لە فۆرمی کۆچبەراندا ئاماژە بەوە کرابوو ئەوانەی کە ماددەی هۆشبەر دەهێنن دەکوژرێن. ئەگەر من بمەوێت سەردانی سەنگافورا بکەم ئەوا دەبێت پابەند بم بە یاساکانی، من ناتوانم بڵێم کە کوشتنی ئەو کەسانەی کە ماددەی هۆشبەر دەبەن سزایەکی دڕندانەیە، من تەنها ئەگەر ڕازی بم بە داواکاری و مەرجەکانیان ئەو کات ڕێگەم دەدەن بچمە وڵاتەکەیانەوە.

**چوارەم:** ڤیزا مەرجی سەرەتاییە بۆ هەر کەسێك کە بیەوێت بچێتە مەککە

یان مەدینە، ئەوا وتنی: **«لا إلـه إلا الله محـمـد رسـول الله»**ەیە، کە بە مانای: «هیچ خوایەك نییە جگە لە خوای ڕاستەقینە، محەمەدیش پەیامبەری خودایە».

# پرسیاری یانزەیەم
# حەرامکردنی گۆشتی بەراز

### بۆچی خواردنی گۆشتی بەراز حەرامکراوە لە ئیسلامدا؟

## وەڵام/

ڕاستی حەرامکردنی گۆشتی بەراز لە ئیسلامدا زۆر ڕوونە، ئەم خاڵانەی خوارەوە لایەنە جیاوازەکانی حەرامکردنەکە ڕوون دەکاتەوە:

### ١- حەرامکردنی گۆشتی بەراز لە قورئاندا:

قورئان لە چوار شوێندا بەکارهێنانی گۆشتی بەرازی حەرامکردووە:

**یەکەم:** {إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللَّهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ} (البقرة: ١٧٣). واتە: (خوای گەورە تەنها هەر ئەمانەی لێ حەرام کردوون: لاکی مردارەوەبوو، خوێنی ڕژاو و ڕەوان، گۆشتی بەراز، هەر ئاژەڵێکیش کە بۆ سەربڕین ناوی غەیری خوای لێ هێنرابێت، بەڵام هەر کەسێك لە بەر ناچاری و بێ ئارەزوو بە ئەندازەی پێویست بخوات و زیادەخۆری نەکات هیچ تاوان و گوناحێکی ناگات لە خواردنی ئەو شتانەدا، بەڕاستی خوا زۆر گوناح پۆش و دلۆڤان و میهرەبانە).

**دووەم:** (حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَنْ تَسْتَقْسِمُوا بِالْأَزْلَامِ ذَلِكُمْ فِسْقٌ الْيَوْمَ يَئِسَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ دِينِكُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِإِثْمٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ) (المائدة: ٣). واتە: (خواردنی گۆشتی مردارەوە بوو و هەر خوێنێك لەهەر ئەندامێکی ئاژەڵ بێتە دەرێ و بڕوا و هەروەها گۆشتی بەرازیش پیسە و لەسەرتان حەرام کراوە و هەر ئاژەڵێکیش کە لە وەختی سەربڕیندا ناوی غەیری خوای لێبهێنرێ و مالاتی خنکاو و لێدراوی مردارەوە بوو و هەلدێراو و لە شاخ بەرەوەبوو و مردارەوەبوو لە شەڕە چەقۆدا و هەرچی دڕندە پەلاماری دابێت و مـردارەوە بوبێت مەگەر بەر لە گیان دەرچوونی فریای کەوتبی و سەرتان بڕی بێت، هەرچی بۆ بتەکانیش سەربڕا حەرامە و هەرچیش لەسەر قوماری تیر دابەش دەکرێت و مەبەستەکانی پێ دیاری دەکرێت قەدەغە و حەرامە، کردنی هەر کارێك لەوانە لە سنوور دەرچوون و نا فەرمانی خوایە و تۆڵە دەدرێت. ئیتر وا ئەمڕۆ ڕۆژی عەرەفەیە و ئەوانەی کە کافر و بێ باوەڕن لە گەیاندنی زیان بە دینەکەتان، کە وا بوو لەوان مەترسن و هەر لەمن بترسن و پارێزگاری لە سنورەکانی من بکەن، وە لە ئەمڕۆوە بەرنامە و ئایینەکەتانم بە پایان گەیاند و نیعمەت و بەخششی خۆمم بۆ تەواو کردن و سەرم خستن بەسەر دوژمانتاندا و ڕێنمایم کردن بۆ ڕێگەی ڕاست، ئیسلامیشم بە بەرنامە و ئایین بۆ هەڵبژاردن، ئینجا لەگەڵ حەرام کردنی ئەو شتانەشدا هەرکەسێك لە برسانا ناچار بوو بۆ خواردنی هەر یەکێك لەو قەدەغەکراوانە و مەترسی

ئەوەی هەبوو گەر شتێك نەخوات لەبرسانا بمرێت دەتوانێ لێیان بخوات بەمەرجێك نەیەوێت خۆی تووشی گوناح بكات و زیادەڕۆیی بكات. بەڕاستی خواش زۆر لێبووردەیە و لەكاتی واشدا شتێك بخوات لێی ناگرێت و زۆریش میهرەبان و دلۆڤانە).

**سێیەم:** {قُلْ لَا أَجِدُ فِي مَا أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَى طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلَّا أَنْ يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنْزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَحِيمٌ} (الأنعام: ١٤٥). واتە: (بەوانە كە لە خۆیانەوە ئەو ئاژەڵ و مەڕ و ماڵاتە یاساغ ئەكەن بڵێ: لەو شتانەدا كە خوای گەورە بۆی ناردووم شتێك نابینەمەوە خواردنی لە كەسێك حەرام بێت باشە ئێوە ئەو هەموو شتانەتان چۆن حەرام كرد؟ بێجگە لە مردارەوە بوو یان خوێنێكی ڕژێنراو یان گۆشتی بەراز كە بێگومان ئەو بەرازە هەموو گیانی پیس و قێزەونە یان مەگەر ئاژەڵێك كە بەناوی غەیری خواوە سەر بڕدرابێت ئینجا هەر كەسێك بە ناچاری بە بێ ئارەزوو ئەو حەرامانە بخوات لە ئەندازەی پێویست نەچێتە دەر هیچ گوناحێكی ناگات چونكە بە ڕاستی پەروەردگارت زۆر لێ بووردەیە و زۆریش بە ڕەحم و میهرەبانە).

**چوارەم:** {إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ} (النحل: ١١٥). واتە: (بەڕاستی خوا هەر گۆشتی مرداربوو و خوێنی ڕەوان و گۆشتی بەراز و ئەو سەربڕاوانەی كە بە ناوی غەیری خواوە سەربڕدراون لێی حەرام كردوون،

جا هەر کەسێك ناچار بوو لە خواردنی ئەوانە دەبا بێ زیادەڕۆیی و بەئەندازەی پێویست لێیان بخوات چونکە خوا زۆر لێبووردە و میهرەبانە).

## ٢- حەرام کردنی گۆشتی بەراز لە ئینجیلدا:

مەسیحییەکان لەلایەن کتێبی پیرۆزیانەوە خواردن و بەکارهێنانی گۆشتی بەرازیان لێ قەدەغەکراوە، لە کتێبی **«لیڤیتیکەس»** هاتووە گۆشتی بەراز نابێت بخورێت، هەروەها لاشەشیان نابێت دەستی لێ بدرێت، چونکە پاك نییە بۆ ئێوە، هەروەها دەقی حەرامکردنەکە لە کتێبی»لیڤیتیکەس» باسکراوەتەوە.

## ٣- بەکارهێنانی گۆشتی بەراز دەبێتە هۆی چەندین نەخۆشی:

ناموسوڵمانەکان و بێباوەڕان تەنها کاتێك بە حەرامکردنی گۆشتی بەراز ڕازی دەبن لە ڕووی زانستی و لۆژیکییەوە بسەلمێنرێت، خواردنی گۆشتی بەراز دەبێتە هۆی (٧٠) جۆری جیاواز لە نەخۆشی، کەسێك کە گۆشتی بەراز بەکاردەهێنێت ڕەنگە تووشی چەندین جۆری جیاوازی کرم ببێتەوە لەوانە کرمی بازنەیی، کرمی دەمبوسی، کرمی قولاپی ...هتد، یەکێك لە هەرە ترسناکترین جۆری ئەو کرمانەی کە لە ئەنجامی خواردنی گۆشتی بەرازەوە تووشی مرۆڤ دەبێت؛ جۆرە کرمێکە کە پێی دەوترێت کرمی شریتی کە بە ڕیخۆڵەوە دەنوسێت و زۆر درێژە، گەراکانی تێکەڵی خوێن دەبێت و، لە ڕێی خوێنەوە دەگاتە هەموو ئەندامەکانی لەش، ئەگەر بچێتە مێشکەوە دەبێتە هۆکاری لە دەستدانی بیر و هزر، ئەگەر بچێتە دڵەوە دەبێتە

هۆی جەڵتەی دڵ، ئەگەر بچێتە چاوەوە دەبێتە هۆی کوێربوون، ئەگەر بچێتە جگەرەوە دەبێتە هۆی تێکچوونی جگەر، ئەو جۆرە کرمە لە توانایدا هەیە هەموو ئەندامەکانی لەش تێکبدات، جۆرێکی تری کرمی ترسناك لە گۆشتی بەراز کرمی قامچییە. تێگەیشتنێکی هەڵەی باو هەیە سەبارەت بە گۆشتی بەراز ئەویش گوایە ئەگەر گۆشتەکە بەباشی بکوڵێنرێت ئەوا ئەو گەرای کرمانەی کە باسمانکرد دەمرن و لەناو دەچن، لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە لە ئەمریکا ئەنجامدراوە ئەوە دەرکەوتووە لە تێکڕای (٢٤) کەس کە بە دەست کرمی قامچییەوە دەناڵێنن (٢٢)یان زۆر بەباشی گۆشتی بەرازیان کوڵاندووە، ئەمە ئەوە دەردەخات کە گەراکانی ناو گۆشتی بەراز بە پلەی گەرمی ئاستی کوڵان لەناو ناچن.

### ٤- گۆشتی بەراز ڕێژەیەکی زۆر چەوری تێدایە:

پێکهاتەی جەستەی بەراز ماسولکەی کەمە لەبەرامبەریدا ڕێژەیەکی بەرچاو لە چەوری لە گۆشتەکەیدا هەیە، ئەم چەورییە لەسەر دەمار دەنیشێ و دەبێتە هۆی بەرزی پەستانی خوێن و جەڵتەی دڵ، جێگەی سەرسوڕمان نییە کە (٥٠٪)ی ئەمەریکییەکان بەدەست بەرزی پەستانی خوێنەوە دەناڵێنن.

### ٥- بەراز یەکێکە لە پیسترین ئاژەڵەکانی سەر زەوی:

بەراز یەکێکە لە پیسترین ئاژەڵەکانی سەر زەوی، بە شێوەیەك لەسەر پاشماوەی ئاژەڵ و خۆڵ و خاشاك و پیسایی گەشە دەکات و پێ دەگات، باشترین کەناس و پاککەرەوەی پیساییە کە تا ئێستا بینیبێتم خوا دروستی

کردبێت. له لادێکان خەڵك توالێتی مۆدێرن و داخراویان نییە، بە گشتی لە دەرەوە پیسایی دەکـەن، زۆربـەی جار پیسایی مرۆڤەکان لەلایەن بەرازەوە پاك دەکرێتەوە، هەندێك موناقەشەی ئەوە دەکەن کە وڵاتانی پێشکەوتووی وەك ئوسترالیا بەرازەکان لە بارودۆخێکی پاك و بێ میکرۆبدا پەروەردە دەکەن، هەرچەندە پاك ڕابگیرێت، بەڵام بەراز سروشتی خۆی وایە کە زۆر پیس و پیسخۆرە؛ تەنانەت ئەگەر شتیان دەست نەکەوێت ئەوا پیسی یەکتر دەخۆن.

## ٦- بەراز بێ شەرمترین ئاژەڵە:

بەراز بێ شەرمترین ئاژەڵە لەسەر ڕووی زەوی، تاکە ئاژەڵە کە هاوڕێکانی بانگهێشت دەکات تاکو سێکس لەگەڵ هاوڕێ مێیەکەیدا بکەن. لە ئەمەریکا زۆر خەڵك گۆشتی بەراز بەکادەهێنێت، زۆرجار دوای ئاهەنگ و سەماکردن هاوسەرەکانیان دەگۆڕنەوە بە شێوەیەکی تر بە یەکتری دەڵێن: «تۆ لەگەڵ هاوسەری من بخەوە و سێکس بکە، منیش لەگەڵ هاوسەرەکەی تۆدا دەخەوم و سێکس دەکەم». ئەگەر ئەوان گۆشتی بەراز بخۆن ئەوا وەك ئەوانیش ڕەفتار دەکەن، ئێمە هەموو تەماشای ئەمەریکای پێشکەوتوو دەکەین هەرچییەك ئەوان بیکەن دوای چەند ساڵێك ئێمەش لاساییان دەکەینەوە و وەك ئەوان دەکەین، بە گوێرەی وتارێك لە گۆڤاری «**Island**»دا هاتووە کە کرداری ئاڵوگۆڕی هاوسەرەکان بووە بە شتێکی باو لە ناو بازنەی دەوڵەمەندەکانی بۆمبای.

# پرسیاری دوانزەهەم

## قــەدەغــەکــردنــی خــواردنــەوەی خــواردنــەوە کحولییەکان

### بۆچی ئایینی ئیسلام بەکارهێنانی کحولی حەرامکردووە؟

## وەڵام/

بەپێی تۆماری مێژوویی کحول بوو بە کۆسپ لەبەردەم کۆمەڵگای مرۆڤایەتی و، بەردەوام دەبێت لە کەمکردنەوەی ژیانی مرۆڤ و، دەبێتە هۆکاری نەهامەتی بۆ ملیۆنان لە جیهاندا، کحول هۆکاری سەرەکی زۆر کێشەی کۆمەڵایەتییە کە ڕووبەڕووی کۆمەڵگا دەبێتەوە و، بەرزبوونەوەی زۆری ڕێژەی تاوان و نەخۆشییە هزرییەکان و، تێکچوونی ماڵی ملیۆنان کەس لە سەرتاسەری جیهاندا، هەموو ئەمانە بە هۆی هێزی تێکدەری کحولەوە دەبێت.

### ١- حەرام کردنی کحول لە قورئاندا:

قورئانی پیرۆز لـەم ئایەتەی خــوارەوەدا حەرامکردنی خــواردنـەوە کحولییەکانی ڕوونکردۆتەوە و دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ} (المائده: ٩٠). واتە: (ئەی گەلی خاوەن باوەڕ بێگومان کە عارەق خۆری و قوماربازی و کاغەزی یانصیب و ئەو بەردەی حەیوانی بتەکانی

لەسەر سەردەبڕێ بۆ بتەکان و فاڵگرتنەوە بۆ دەرکەوتنی بارێکی چاك یان خراپ، ئەمانە گشت پیسن و لە کاری شەیتانن، ئێوە خۆتانی لێ دووربگرن تا بەڵکو لە دونیا و لە قیامەتدا ڕزگار و بەختەوەر بن).

## ٢- حەرامکردنی خواردنەوە کحولییەکان لە ئینجیلدا:

ئینجیل بەکارهێنانی خواردنەوە کحولییەکانی حەرامکردووە لەم چەند بڕگەیەی خوارەوەدا:

**یەکەم:** شەراب گاڵتەپێکەرە، خواردنەوەیەکی بەهێزی تووڕەکەرە و، فێڵ لە هەر کەسێك دەکات کە دەیخواتەوە و ژیری لێ دەستێنێت.

**دووەم:** «نابێت شەراب بخورێتەوە» (ئیفیژنس ١٨:٥) (پرۆڤێربس ١:٢٠).

## ٣- خواردنەوە کحولییەکان کاردەکاتە سەر سەنتەری ڕێگەگرتن:

مرۆڤ خاوەنی سەنتەرێکی ڕێگەگرتنە لە مێشکیدا، ئەم سەنتەرە ڕێگە دەگرێت لە مرۆڤ ئەو کارانە ئەنجام بدات کە بە هەڵە دادەنرێن. بۆ نموونە، کەسێك لەباری ئاسایدا زمانێکی خراپ بەکارناهێنێت لەکاتی قسەکردن لەگەڵ دایك و باوکیدا، یان کەسانی لە خۆی گەورەتر، لەکاتی وەڵامدانەوەی تەلەفۆندا سەنتەری ڕێگەگرتنی مێشکی ڕێگری دەکات لەوەی کە بە خراپی وەڵام بداتەوە. کاتێك کەسێك خواردنەوەی کحولی بخواتەوە سەنتەری ڕێگەگرتنی مێشکیشی مەست دەبێت، ئەمەش بە وردی هۆکارەکەی ئەوەیە کە کەسێکی سەرخۆش زۆرجار سەرقاڵ دەبێت بە هەڵسوکەوتێکەوە کە تەواو جیاوازە لە کەسایەتی خۆیەوە. بۆ نموونە،

کەسی مەست بوو وا دەبینرێت کە زمانی سووك و بازاڕی بەکاردێنێت و، درکیش بەهەڵەکانیشی ناکات کاتێك لەگەڵ دایك و باوکی قسە دەکات، زۆریان لە بێئاگاییان میز دەکەن بە جلوبەرگەکەیاندا، تەنانەت ناتوانن بە باشی قسە بکەن، یان بە ڕێگادا بڕۆن.

## ٤- حاڵەتەکانی وەکو زینا و لاقەکردن و، سێکسی نێوان خوشك و برا و، ئایدز، زیاتر لە نێوان ئەو کەسانەدا زیاترە کە ماددەی کحولی بەکاردەهێنن:

بە گوێرەی نوسینگەی ڕزگاربووانی قوربانیانی تاوانی نەتەوەیی لەساڵی (١٩٩٦ز)دا ڕۆژانە بە تێکڕای (٢٧١٣) دەستدرێژی سێکسی ئەنجامدراوە، ئەم سەرژمێرییە ئەوەمان پێدەڵێت کە دەستدرێژیکەرانی سێکسی لەو کاتەی کە تاوانەکەیان ئەنجامداوە کەسانی سەرخۆش بوون، هەمان حاڵەت بۆ ئازاردانیش ڕاستە، بە گوێرەی سەر ژمێرییەکان (٨٪)ی ئەمریکییەکان کرداری سێکس لەنێوان خوشك و براکانیان ئەنجامدەدەن، بە واتایەکی تر لە هەموو دوانزە بۆ سیانزە کەسێکدا یەکێکیان سێکسی لەگەڵ برا یان خوشکیدا کردووە، زۆربەی ئەو حاڵەتانەش بەهۆی سەرخۆشبوونی یەکێك یان هەردوو کەسەکەوە بووە، یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی بڵاوبوونەوەی ئایدز بەهۆی کحولەوە بووە.

## ٥- هەموو بەکارهێنەرانی ماددە کحولییەکان لەسەرەتادا لە کەمەوە دەستیانپێکردووە:

هەندێك کەس پشتگیری لەوە دەکەن کە ئەوان لە کەمەوە دەستیانپێکردووە،

ئەوان دەڵێن لە ڕۆژێکدا یەك یان دوو پێك دەخۆنەوە و، دەتوانن کۆنترۆڵی خۆیان بکەن و هەرگیز نایەڵن کە تەواو سەرخۆش بن، لێکۆڵینەوەیەك ئـەوەی دەرخستووە کە هەموو ئەو کەسانەی کە مـاددەی کحولی بەکاردەهێنن لە سەرەتا لەکەمەوە دەستیانکردووە بەبەکارهێنانی مادده کحولییەکان، پاشان بەرە بەرە زیادیان کردووە، هیچ کەسێك نییە یەکسەر و لە پڕدا بووبێت بە مەشروبخۆرێکی تەواو، هیچ کەسێك لە وانەی کە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە کەم دەخۆنەوە ناتوانن بڵێن هەرگیز سەرخۆش نەبوون، یان هەرگیز کۆنترۆڵی خۆیان لە دەست نەداوە تەنها بۆ جارێکیش بێت.

## ٦- ئەگەر کەسێك تەنها بۆ جارێکیش سەرخۆش بێت و، کارێکی شەرمەزارکەرانە ئەنجام بدات؛ ئەوا ئەو کارە ئەگەر تەنها بۆ جارێکیش بووبێت بۆ هەتا هەتایە لە ژیانیدا دەمێنێتەوە:

وا دابنێ کە یەکێك لەو کەسانەی کە کەم دەخۆنەوە تەنها بۆ جارێك کۆنترۆڵی خۆیان لە دەست دابێت، لە حاڵەتی سەرخۆش بووندا دەستدرێژی سێکسی کردە سەر کەسێك، یاخود لەگەڵ خوشك یان برایەکیدا سێکسی کرد، هەرچەند دواتر پەشیمان بێتەوە ئەوا ئەو کەسە ئەو تاوانە لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت بە درێـژای تەمەنی ئەو کەسەی کە تاوانەکەی ئەنجامداوە و، ئەو کەسەی کە تاوانەکەی بەرامبەر ئەنجامدراوە بووە بە قوربانی و بە تەواوی دەڕووخێت.

## ٧- حەرامکردنی مادده کحولییەکان لە فەرموودەدا:

پێغەمبەری ئیسلام موحەمەد (د.خ) دەفەرموێت:

**یەکەم:** لە سونەنی ئیبن ماجە زنجیرەی (٣) لە کتێبی سەرخۆشکەرەکان بەشی (٣٠) فەرموودەی ژمارە (٣٣٧١)دا هاتووە دەفەرموێت: « کحول دایکی هەموو خراپییەکانە و ئابڕووبەرترینی خراپەکانە».

**دووەم:** لە سونەنی ئیبن ماجە زنجیرەی (٣) لە کتێبی سەرخۆشکەرەکان بەشی (٣٠) فەرموودەی ژمارە (٣٣٩٢)دا هاتووە دەفەرموێت: «هەر شتێك بە ئاستێکی زۆر سەرخۆشت بکات، ئەوا حەرامکراوە ئەگەر بڕێکی زۆر کەمیشی لێ بخورێـتەوە». کەواتە هیچ پاساوێك نییە بۆ قووم یان پێکێك.

**سێیەم:** لە سونەنی ئیبن ماجە زنجیرەی (٣) لە کتێبی سەرخۆشکەرەکان بەشی (٣٠) فەرموودەی ژمارە (٣٣٨٠)دا هاتووە دەفەرموێت: «نەك تەنها ئەو کەسەی کە کحولەکە دەخواتەوە، بەڵکو ئەو کەسەی کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ مامەڵەی پێوە دەکات بەرنەفرەتی خوا کەوتووە».

**چوارەم:** لە ئەنەسەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا موحەمەد (د.خ) فەرموویەتی: «نەفرەتی خودا بە (دە) گرووپ و تاقم دەکەوێت لەو خەڵکانەی مامەڵە بە شـەراب و مـادده کحولییەکانەوە دەکـەن. لەو کەسانەش: ئەو کەسەی دەیپاڵێوێت، ئەو کەسەی کە بۆی دەپاڵێورێت، ئەو کەسەی کە دەیخواتەوە، ئەو کەسەی کە دەیگوازێتەوە، ئەو کەسەی

که بۆی دەبرێت، ئەو کەسەی کە خزمەتی پێوەدەکات، ئەو کەسەی کە دەیفرۆشێت، ئەو کەسەی کە پارەی پێ پاشەکەوت دەکات، ئەو کەسەی کە دەیکڕێت، ئەو کەسەی کە بۆ کەسێکی تری دەکڕێت».

## ٨- ئەو نەخۆشییانەی کە لە کحولەوە تووش دەبین:

چەندین هۆکاری پزیشکی هەیە لە حەرامکردنی بەکارهێنانی مادده کحولییەکان، زۆرترین ژمارەی مردن پەیوەندی هەیە بەهەر کەسێکەوە کە بە شێوەیەکی تایبەت مادده کحولییەکان بەکاردەهێنن، ساڵانە ملیۆنان خەڵك دەمرن بەهۆی بەکارهێنانی کحولەوە، من نامەوێت بچمە وردەکاری هەموو کاریگەری ئەو نەخۆشییانەی کە لە ئەنجامی کحولەوە تووشی مرۆڤ دەبن، چونکە زۆربەیان ناسراون، لە خوارەوە لیستێك لەو نەخۆشییانە باسدەکەم:

**یەکەم:** نەخۆشی درێژخایەنی جگەر کە نەخۆشییەکی زۆر ناسراوە.

**دووەم:** نەخۆشییەکانی شێرپەنجە وەکو شێرپەنجەی سەر دڵ، شێرپەنجەی جگەر، شێرپەنجەی ڕیخۆڵە ...هتد.

**سێیەم:** هەڵئاوسانی گەدە، هەڵئاوسانی پەنکریاس، هەڵئاوسانی جگەر، هەمووی پەیوەستن بە بەکارهێنانی کحولەوە کە مرۆڤ تووشی دەبێت.

**چوارەم:** نەخۆشی ماسولکەکانی دڵ، بەرزی پەستانی خوێن لە ڕێژەی

ئاسایی خۆی، نەخۆشی خوێنبەرەکان، جەڵتەی دڵ.

**پێنجەم:** جەڵتەی دەماغ، دەرکەوتنی لەپڕ و جۆراوجۆری ئیفلیجی

**شەشەم:** حاڵەتی وەستانی ناردنی پەیام بۆ مێشك و دڕکەپەتك، تێکچوونی ئەو دەمارانەی کە پەیوەندییان هەیە بە ڕاگرتنی باڵانسی مرۆڤەوە.

**حەوتەم:** تووشبوون بە لەدەستدانی یادەوەری.

**هەشتەم:** تووش بوون بە نەخۆشییەکانی وەکو «بیری بیری» و، «بیلاگرا».

**نۆیەم:** دەرکەوتنی نیشانەی ترسناك، ڕەنگە هەندێك جار ببێتە هۆی مردن لەکاتی ژەهراویبوون بە مادده کحولییەکان و وازلێهێنان.

**دەیەم:** کاریگەرییەکانی نەخۆشییەکانی خوێن؛ لەوانە کەمبوونی ترشی فۆلیك و، باوترین خستنەڕووی خراپ بەکارهێنانی کحول دەبێتە هۆی گەورەبوونی قەبارەی خڕۆکە سوورەکان لە چاو قەبارەی ئاسایی خۆی و، لەناوچوون و تێکچوونی خڕۆکە سوورەکان و بەرزبوونەوەی چەوری خوێن.

**یازدەیەم:** کەمبوونەوەی پەڕەکانی خوێن کە دەبێتە هۆی درەنگ مەیینی خوێن لە دوای برینداربوون.

**دوازدەیـەم:** بەکارهێنانی حەبی «فلاجیل» بە شێوەیەکی خراپ لەگەڵ مادده کحولییەکاندا کارلێك دەکات.

**سیازدەیەم:** تێکچوونی سیستمی بەرگری لەش.

**چواردەیەم:** خواردنی لە ڕادەبـەدەری مادده کحولییەکان دەبێتە هۆی ئاوسانی سی و، مردنی ڕیشاڵەکانی دەمار و، ئەستووربوونی سپڵ.

**پازدەیەم:** لەکاتی تەواو سەرخۆش بوون کەسی سەرخۆش بەشێوەیەکی هەمیشەیی دەڕشێتەوە و، لەکاتی ڕشانەوە دەچەمێتەوە و، ئەوەی دەیڕشێنێتەوە بە ئاسانی دەچێتە سییەکانیەوە و دەبێتە هۆی خنکان و مردن.

**شازدەیەم:** کاریگەری زۆر خراپی هەیە لەسەر ئافرەتان؛ بە تایبەت لەکاتی دووگیانیدا زیانێکی زۆر دەگەیەنێت بە کۆرپەکەی.

**حەڤدەیەم:** نەخۆشییەکانی پێست پەیوەندییەکی زۆریان هەیە بە مادده کحولییەکانەوە.

**هەژدەیەم:** ئەکزیما و هەڵوەرینی نینۆك و سووتانەوەی گۆشەی دەوروبەری دەم.

٩- خووگرتن بە مادده کحولییەکانەوە نەخۆشییە، پزیشکەکان ئێستا دەتوانن ئازادانە ڕوو بکەنە ئەو کەسانەی کە ماددەی کحولی بەکاردەهێنن و، پێیان بڵێن کە خووگرتن بە مەشروب خواردنەوەوە نەخۆشییە زیاتر لەوەی ئالوودەبوون بێت، دامەزراوەی لێکۆڵینەوەی ئیسلامی لەناملیکەیەکدا بڵاوی کردووەتەوە و ئاماژەی بەوە کردووە کە ئەگەر مادده کحولییەکان نەخۆشی بێت تەنها نەخۆشییەکە:

*** کە بە بوتڵ دەفرۆشرێت.**
*** ڕیکلامی بۆ دەکرێت لە ڕۆژنامە و گۆڤار و ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکاندا.**
*** مۆڵەتی بڵاوبوونەوەی پێدراوە.**
*** قازانج بەرهەم دێنێت بۆ حکومەت.**
*** دەبێتە هۆی مردن لە ڕێگا خێراکاندا.**
*** ژیانی خێزانی تێکدەشکێنێت و، ڕێژەی تاوان بەرز دەکاتەوە.**

خووگرتن بە مادده کحولییەکانەوە نەخۆشی نییە، بەڵکو کاری شەیتانە. خوای گەورە بە هەموو دانایی ئاگادارمان دەکاتەوە کە دووربکەوینەوە لە شەیتان. ئیسلام کە پێی دەوترێت: «ئایینی سروشتی مرۆڤ» کحولی حەرامکردووە، بەکارهێنانی مادده کحولییەکان لادانی مرۆڤە لە بارودۆخی ئاسایی خۆی؛ بە شێوەیەك ئاستی مرۆڤەکان بۆ ئاستی گیانلەبەرەکان دادەبەزێنێت، هەربۆیە بەکارهێنانی مادده کحولییەکان لە ئیسلامدا حەرامە و قەدەغەکراوە.

# پرسیاری سیانزەهەم
# یەکسانی لە شایەتیداندا

## بۆچی دوو شایەتی ئافرەت یەکسانە بە یەک شایەتی پیاو؟

## وەڵام/

ئەوە ڕاست نییە کە دوو شایەتی ئافرەت هەمیشە یەکسانە بە یەك شایەتی پیاو، ئەوە تەنها لە چەند حاڵەتێکدا وایە، وا حیسابی بۆ دەکرێت، لە قورئاندا زیاتر لە پێنج ئایەت هاتووە کە ئاماژە بۆ شایەتیدان دەکات بە بێ جیاکاریکردن لە نێوان پیاو و ئافرەتدا؛ لە بەرامبەردا تەنها یەك ئایەت هاتووە کە دەفەرموێت دوو شایەتی ئافرەت یەکسانە بە یەك شایەتی پیاو، ئەویش لە سوورەتی (البقرة ئایەتی ٢٨٢) کە درێژترین ئایەتی قورئانە کە باس لە مامەڵەی دارایی دەکات. خوای گەورە دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آَمَنُوا إِذَا تَدَايَنْتُمْ بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَاكْتُبُوهُ وَلْيَكْتُبْ بَيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ وَلَا يَأْبَ كَاتِبٌ أَنْ يَكْتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ اللَّهُ فَلْيَكْتُبْ وَلْيُمْلِلِ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ وَلْيَتَّقِ اللَّهَ رَبَّهُ وَلَا يَبْخَسْ مِنْهُ شَيْئًا فَإِنْ كَانَ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ سَفِيهًا أَوْ ضَعِيفًا أَوْ لَا يَسْتَطِيعُ أَنْ يُمِلَّ هُوَ فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُ بِالْعَدْلِ وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ مِنْ رِجَالِكُمْ فَإِنْ لَمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّنْ تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاءِ أَنْ تَضِلَّ إِحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَى وَلَا يَأْبَ الشُّهَدَاءُ إِذَا مَا دُعُوا وَلَا تَسْأَمُوا أَنْ تَكْتُبُوهُ صَغِيرًا أَوْ كَبِيرًا إِلَى أَجَلِهِ ذَلِكُمْ أَقْسَطُ عِنْدَ اللَّهِ وَأَقْوَمُ لِلشَّهَادَةِ وَأَدْنَى أَلَّا تَرْتَابُوا إِلَّا أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً حَاضِرَةً تُدِيرُونَهَا بَيْنَكُمْ

فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَلَّا تَكْتُبُوهَا وَأَشْهِدُوا إِذَا تَبَايَعْتُمْ وَلَا يُضَارَّ كَاتِبٌ وَلَا شَهِيدٌ وَإِنْ تَفْعَلُوا فَإِنَّهُ فُسُوقٌ بِكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللَّهُ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ). (البقرة: ٢٨٢) واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە هەرکات قەرز و قۆڵەی ماوەدارتان لەگەڵ یەکتردا کرد وە یان کڕین و فرۆشتنتان بە قەرز کرد بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بینوسن با نوسەرێکی خاوەن داد بە دادگەرانە بینوسێت و بە لای هیچ کەسێکدا نەڕوات ناشێت هیچ نوسەرێك سەرپێچی بکات لە نوسینی «قەباڵە»کەدا هەرچۆنێك خوا فێری نوسینی کردووە با بینوسێت خۆ ئەگەر قەرزارەکەش خوێندەوار نەبوو تا خۆی بینوسێت دەبێت بۆ خۆی حەقەکە بەیان بکات و نوسەرەکەش بینوسێت دەبێت لە خوای پەروەردگاری خۆی بترسێت لەکاتی نوسینەکەدا کەم و کورتی لە هیچ شتێکی دا نەکات، ئینجا ئەگەر قەرزارەکە هەڵەشە و نەزان بوو یان لە ڕووی ئەقڵەوە بێ هێز و لاواز بوو وە یان نەیدەتوانی ئەوەی پێویستە بیڵێ و بنوسرێ با چاودێر و سەرپەرشت کارەکەی بە دادگەرانە سەنەدەکە داڕێژێت و نوسەرەکەش بینوسێ، دەبێت دوو پیاوی موسوڵمان لە خۆتان بۆ ئەو کارە شایەت بن خۆ ئەگەر دوو پیاو دەست نەکەوتن با پیاوێك و دوو ئافرەت بن بە شایەت کە ئێوەش بە شایاتی دانیان ڕازی بن و پەسەندیان بکەن تا ئەگەر یەکێك لەو دوو ئافرەتە لە بیری چوو ئەوی تریان بەبیری بهێنێتەوە، هەر وەختێکیش شایاتەکان بانگ کران بۆ شایەتی دان یان بۆ هەڵگرتنی شایەتی نابێ خۆ بگرن و دوور بن و ئامادە نەبن، هەرگیز نابێ لە نوسینی ماوەیەی قەرز کەم بێت یان زۆر ماندوو بن و لەش گرانی بکەن و پشت گوێی بخەن، ئەو نوسینە بەو شێوەیە لای خوا دادگەرانە تر و پەسەندترە، چاکتریش دەتوانن شایەتی ڕابگرن و بۆ نەهێشتنی گومان

و دوودڵیش چ بۆ شایەت، چ بۆ دادوەر، چ بۆ قەرزدار باشترە، هەموو کات بینوسن مەگەر وەختێك بازرگانی ئاڵوگۆڕتان دەست بە دەست و بە نەقدی بێت ئەوسا گوناحتان ناگات ئەگەر نەینوسن، شایەت بگرن لە کاتی کڕین و فرۆشتندا نابێت چ نوسەر، چ شایەت زیانتان پێبگەیەنن و ئازارتان بدەن بەو شێوەیەی کە حەقەکە نەنوسن و شایەتی بە حەق نەدەن، خۆ ئەگەر وا نەکەن ئەوا لە سنوور دەرچوون و گوناحی لەملی خۆتانە، دەشێ لە خوا بترسن، خوا فێری زانست و کاروباری بازرگانیتان دەکات و خوا بە هەموو شتێك بە ئاگایە).

ئەم ئایەتی قورئانە باس لە مامەڵەی دارایی دەکات، لە حاڵەتی ئاوەهادا ئامۆژگاری کراوە کە نووسینێکی ڕەزامەندی بنووسرێت لە نێوان دوو لایەنەکەدا و، دوو شایەتیش ئامادەبن، وا باشترە کە هەردوو شایەتەکە پیاو بن، لە حاڵەتێکدا کە دوو پیاو پەیدا نەبوون ئەوا ئەو کات دوو ئافرەت و پیاوێك بە شایەت دەگیرێن.

بۆ نموونە، وا دابنێ کەسێك بە دەست نەخۆشییەکەوە دەناڵێنێت و، دەیەوێت نەشتەرگەری بکات؛ بۆ ئەوەی چارەسەری خۆی بکات وا باشترە دوو پزیشکی لێهاتوو نەشتەرگەرییەکە ئەنجام بدەن، لە حاڵەتێکدا ئەگەر دوو پزیشکی دەست نەکەوت ئەوا بژاردەی دووەم لە بەردەمیدا بریتییە لەوەی کە یەکێك لە پزیشکەکان و دوو یاریدەدەری پزیشکی نەشتەرگەرییەکە ئەنجام بدەن، هاوشێوەی ئەمە لە مامەڵەی دارایدا دوو پیاو پەسەندترە، ئیسلام پیاو بە پەیداکەری بژێوی خێزان هەژمار دەکات، هەرچەندە لێپرسراوێتی دارایی دەبێت پیاو بێت، چونکە ئەوان بە باشتر و شارەزاتر دادەنرێن لە مامەڵەی دارایدا بەبەراورد بە ژنان، بژاردەی دووەم

که دەبێت پیاوێك و دوو ئافرەت بێت ئەگەر هاتوو یەکێك لە ئافرەتەکان هەڵەیەکی کرد، ئەوا ئافرەتی دووەم ئاگاداری دەکاتەوە، ئەو وشە عەرەبییەی قورئاندا بەکارهاتووە بریتیە لە **«نزیل»** کە بە مانای **«شڵەژان»** یان **«هەڵە»** دێت، زۆر کەس هەڵە لێکدانەوە و وەرگێڕانیان بۆ ئەو وشەیە کردووە، پێیان وایە بە مانای **«لەبیرکردن»** دێت، لەبەر ئەم هۆیە کە لەحاڵەتی مامەڵەی دارایدا دوو ئافرەت بەرامبەر بە یەك پیاو هەژماردەکرێت، هەرچەندە لە هەندێك حاڵەتی وەکو کوشتنی دوو ئافرەت بەرامبەر بە یەك پیاو هەژماردەکرێت لە شایەتیداندا، ئەویش هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لە حاڵەتی وەهادا ئافرەتان زیاتر تووشی شڵەژان دەبنەوە بەبەراورد بە پیاوان، ئەویش بەهۆی ئەو بارە سۆزدارییانەی کە هەیانە، لەهەموو حاڵەتەکانی تردا یەك پیاو بەیەك ئافرەت هەژمار دەکرێت، نزیکەی پێنج ئایەت هەن لە قورئاندا کە باسی شایەتدان دەکەن بەبێ جیاوازیکردن لە نێوان پیاوان و ئافرەتاندا و، لەکاتی وەسێتکردندا تەنها دووکەس پێویستە بۆ شایەتیدان، لە سوورەتی (المائدة) لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە:

* {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آَمَنُوا شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ حِينَ الْوَصِيَّةِ اثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِنْكُمْ أَوْ آَخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ إِنْ أَنْتُمْ ضَرَبْتُمْ فِي الْأَرْضِ فَأَصَابَتْكُمْ مُصِيبَةُ الْمَوْتِ تَحْبِسُونَهُمَا مِنْ بَعْدِ الصَّلَاةِ فَيُقْسِمَانِ بِاللَّهِ إِنِ ارْتَبْتُمْ لَا نَشْتَرِي بِهِ ثَمَنًا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى وَلَا نَكْتُمُ شَهَادَةَ اللَّهِ إِنَّا إِذًا لَمِنَ الْآَثِمِينَ} (المائدة: ١٠٦)، واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە هەرکات یەکێکتان مەرگی هات ویستی وەسیەتێك بکات دەبێت لە کاتی وەسیەتەکەدا دوو کەسی دادگەر لە خۆتان بکەن بە شایەت، خۆ ئەگەر چوونە سەفەر و مەرگتان ئاوقەد

بوو موسوڵمانیشتان دەست نەکەوت دەتوانن دوو کەسی تر لە غەیری خۆتان بکەن بە شایەت ئینجا ئەگەر لەو دوو شایەتە بەد گومان بوون هەتا دوای نوێژی عەسر هەردوو ڕاگرن دەبێت سوێندێك بخۆن کە ئێمە لە بەر هیچ کەس دینمان بە هیچ شتێك نافرۆشین، هەرچەندە ئەو کەسە بە سوێندەکەی ئێمە شتێکی دەست بکەوێت خزمیشمان بێت و شایەتی خواش نەشارینەوە ئەگەینە تاوانبار و گوناح بار دەبین ئینجا ئەگەر دوای سوێند خواردنەکە دەرکەوت کە دوو شایەتەکەی پێشوو درۆیان کردووە و خۆیان تاوانبار کردووە بە بێ دوو کەسی شیاو و نزیکتر لە میرات بەرانی مردووەکە لە جیاتی ئەو دوو شایەتە پێشووە درۆزنە بێنە پێش سوێندێك بخۆن و بڵێن سوێند بە خوا ئەم شایەتیەی ئێمە لە شایەتیەکەی ئەوان ڕاسترە و حەقترە وە لە هەقیش لامان نەداوە دەنا لە ستەمکاران دەبین، ئینجا پاش سوێند خواردنەکە ماڵەکە دەدرێتەوە بە میراتبەرانی مردووەکە.

* {وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ} (النور: ٤)، واتە: (ئەو کەسانەش کە ژنانی داوێن پاك تۆمەتبار دەکەن بە زینا پاشان چوار شایەت ناهێنن بۆ چەسپاندنی داواکەیان دەبێت هەشتا شەلاقیان لێبدەن تا جارێکی تر بە ناهەق و ناڕەوا ناموسی خەڵك لە کەدار و بریندار نەکەن هەتا هەتایە نابێت شایەتیشیان بۆ شتی تر لێوەر بگرن، ئا ئەوانەن لە سنووردەرچووان و لای خوا بە فاسق ئەدرێن لە قەڵەم).

هەندێك توێژەر ئەو ڕایەیان هەیە کە ڕۆڵی دوو ئافرەت لە شایەتیداندا

بەرامبەر بەیەك پیاو پێویستە بۆ هەموو حاڵەتەکان جێبەجێ بکرێت، ئەمە ناتوانرێت ڕەزامەندی لەسەر بدرێت، چونکە تەنها یەك ئایەتی دیاریکراوی قورئان ئەویش سوورەتی (النور)ە ئایەتی (٦) بە ڕوونی دوو شایەتی ئافرەت بەرامبەر بە یەك شایەتی پیاو دادەنێ.

* {وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنْفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ} (النور: ٦)، واتە: (ئەو کەسانەش کە تۆمەتی زینا دەدەنە پاڵ هاوسەرەکانیان لە هەمان کاتدا بێجگە لە خۆیان شایەتی تریان نییە تا شایەتیان بۆ بدەن کە ئەو ژنە زینای کردووە جا بۆ ئەوەی ئەو هەشتا شەلاقەیان لە کۆڵ بێتەوە ئەوا ئەبێت هەریەك لەو جۆرە پیاوانە چوار جار بە ناوی خواوە شایەتی بدات و سوێند بخوات بە خوا و بڵێت بە ڕاستی من لە ڕاستگۆیانم).

فەرموودەیەکی حەزرەتی عائیشە (ر.ع) لەسەر یەك شایەتی دەگێڕێتەوە زۆر یاسازانان هاوڕان لەسەر ئەوەی تەنانەت یەك شایەتی ئافرەت بەسە بۆ بینینی مانگ، بیهێنە بەر چاوی خۆت یەك ئافرەت بەس بێت بۆ یەکێك لە کۆڵەکەکانی ئیسلام، بە مانایەکی تر ڕۆژووگرتن یان هەموو کۆمەڵگای موسوڵمانانی پیاو و ژنان ڕازی دەبن، یان شایەتییەکەی قبوڵ دەکەن! هەندێك لە یاسازانان دەڵێن کە یەك شایەت داوا دەکرێت لە سەرەتای مانگی ڕەمەزاندا و، دوو شایەت بۆ کۆتایی ڕەمەزان، هیچ جیاوازییەکی نییە ئەگەر شایەتەکان ئافرەت یان پیاو بن.
هەندێك ڕووداو تەنها شایەتی ئافرەت داوا دەکرێت و شایەتی پیاو قبوڵ

ناکرێت، بۆ نموونە لە کێشەکانی ئافرەتاندا لە کاتی شوشتنی جەستەی ئافرەتی مردوو شایەتەکە دەبێت ئافرەت بێت. بۆیە وەرگرتنی شایەت لە باروودۆخەکاندا جیاواز لە نێوان پیاو و ژندا لە هەندێك حاڵەتدا شایەتی پیاو قبوڵ دەکرێت و شایەتی ژن قبوڵ ناکرێت و بە پێچەوانەوە، ئەمەش بە هۆی ڕۆڵ و سروشتی پیاوان و ئافرەتانەوەیە لە کۆمەڵگادا لەسەر بنەمای ئایینی ئیسلام.

# پرسیاری چواردەهەم / میرات

**لە ژێـر سایەی یاسای ئیسلامدا بۆچی لە کاتی دابەشکردنی میراتی باواندا ئافرەت نیوەی پیاوی بەردەکەوێت؟**

## وەڵام/

**لەقورئانی پیرۆز ڕێنمایی تایبەت و ورد سەبارەت بە دابەشکردنی میرات هەیە. لەوانە:**

* {كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِنْ تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ} (البقرة: ١٨٠)، واتە: (لەسەرتان نوسراوە کە کەسێکتان کەوتە سەرەمەرگ، ماڵ و دارایی لەدوا بەجێما دەبێت بە شێوەیەکی پەسەند وەسیەت بکا کە باوك و دایك و خزمانی هەر کەسە و بەشی خۆی پێبگا تا ببێتە مایەی خۆشبەختی و دڵ خۆشکردنیان، خەڵکانی خواناس و پارێزکار هەقە ئەم کارە بکەن).

* {وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنْكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لِأَزْوَاجِهِمْ مَتَاعًا إِلَى الْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِي أَنْفُسِهِنَّ مِنْ مَعْرُوفٍ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ} (البقرة: ٢٤٠)، واتە: (ئەو کەسانە لە ئێوە لەسەرە مەرگدان و دەمرن و ژنەکانیان لەدوای خۆیان بەجێدەهێڵن با پێش ئەوەی گیانیان دەربچێ ڕاسپێرن و وەسیەت بکەن کە ژنەکانیان «ئەگەر ویستیان» تا

ماوەی ساڵێك دەرنەکرێن و هەر لەجێی خۆیان بمێننەوە و خەرجیان بدەن، خۆ ئەگەر بە ویستی خۆیان دەرچوون و گوناهیشیان لەسەر ئێوە نابێت سەبارەت بە هەر کارێکی پەسەند و شیاو بۆ خۆیان دەیکەن، خوا باڵادەست و کارجوان و کار دروستە).

* {لِلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا مَفْرُوضًا (٧) وَإِذَا حَضَرَ الْقِسْمَةَ أُولُوا الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينُ فَارْزُقُوهُمْ مِنْهُ وَقُولُوا لَهُمْ قَوْلًا مَعْرُوفًا (٨) وَلْيَخْشَ الَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَافًا خَافُوا عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا اللَّهَ وَلْيَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا} (النساء: ٧-٩)، واتە: (لەو کەلەپوورەی کە لە دوای باوك و دایك و خزمانی نزیك بە جێ دەمێنێ نێرینە بەشی خۆی هەیە و هەروەها لەو میراتەش لە باوك و دایك و خزمانی نزیك بەجێدەمێنێ مێینەش بەشی خۆی هەیە. ئەو میراتە کەم بێت یان زۆر بەشی هەرکەسێك لەلایەن پەروەردگارەوە دیاریکراوە و بڕاوەتەوە و دەبێت بدرێ، هەر کە لە کاتی دابەشکردنی کەلەپوورەکەدا خزمانی نزیکی مردوو و میرات نەگر وە هەتیوان و بێ نەوایان لەوێ بوون دەبێت لەو میراتە شتێکیان بدەنێ و بێ بەشیان نەکەن هەرچەند میراتیشیان ناکەوێ وە بەڕووی خۆش و جوانەوە قسەیان لەگەڵ بکەن با دڵیان نەڕەنجێ و لێتان نەتۆرێن وە ئەو کەسانەش کە لە پاش خۆیان چەند وەچە و منداڵێکی لاواز و بێدەسەڵات بەجێ دێڵن دەبا لە کاتی وەست کردنەکەدا ترسی خوایان لە دڵدا بێت و شتێکی وا لە پاش خۆیان ڕانەسپێرن ناهەقی و ستەم بێت، با لە خوا بترسن و هەمیشە بەرامبەر بە مافەکانیان قسەی باش و پەسەند بکەن).

* ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آَمَنُوا لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهًا وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آَتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّا أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِنْ كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا﴾ (النساء : ١٩)، واته: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بۆ ئێوە ڕەوانییە بە زۆرداری ژنان بکەن بە میرات و دەستیان بەسەردا بگرن نابێ تەنگەتاویان بکەن و ئازاریان بدەن لەبەرئەوەی کە هەندێ لەو مارەییەی کە پێتانداون دەسهەڵگرن، جا مەگەر بە ئاشکرا داوێن تەڕی و زینا بکەن یان هەرکارێکی تری نابەجێ بکەن، بە باو و نەریتێکی پەسەند و جوان هاوکاریان بکەن مامەڵەتان چاك بێت لەگەڵیاندا، ئینجا ئەگەر بەهۆی لاسارییانەوە ژیان لەگەڵیاندا نەدەگونجا ددان بە خۆتانا بگرن و ئێوە هەر چاك بن چونکە گەلێ شتی وا هەیە ئێوە خۆشیتان لێنایە کەچی خوا خێر و چاکەیەکی زۆری تیا داناوە).

* ﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ فَآَتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا﴾ (النساء :٣٣)، واتە: (بۆ هەر میراتبەرێك چەند کەسێکمان داناوە بە میراتگر لەو میراتەی باوك یان دایك و خزمی نزیك بەجێیان هێشتووە میرات بگرن، ئەو کەسانەش کە پەیمانتان لەگەڵ بەستوون هەرکات مردن و ماڵێکیان لەدوا بەجێما دەبێت ئێوە مافی خۆیانیان پێبگەیەنن و هاوکاریان بکەن و خیانەت لە یەکتر نەکەن، بەڕاستی خوا بەسەر هەموو شتێکا هەمیشە شایەت و ئاگادارە).

لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە لە چەند ئایەتێکدا بەوردی باسی شێوازی دابەشکردنی میرات دەکات، لەوانە:

* {يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ فَإِنْ كُنَّ نِسَاءً فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ وَإِنْ كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِنْ كَانَ لَهُ وَلَدٌ فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ الثُّلُثُ فَإِنْ كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ السُّدُسُ مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ لَا تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعًا فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا} (النساء: ١١)، واته: (ئاگاداربن! خوا سەبارەت بە کاروباری منداڵەکانتان وەسیەتتان بۆ دەکا پێتان ڕائەگەیەنێ کە دەبێت لە کەمیراتەکەتاندا دوو ئەوەندەی بەشی مێینە بدەنە نێرینە، خۆ ئەگەر ئافرەتە میراتگرەکان دووان بوون یان زیاتر، دوو بەش لە سێ بەشی میراتەکە دەبەن، خۆ ئەگەر مێینەکە تەنیا کچێك بوو، نیوەی میراتەکە بۆ ئەوە و شەش یەکیش دەدرێ بە هەریەکە لە باوك و دایکی مردووەکە لەو کەلەپوورەی بەجێی هێشتووە بەمەرجێ مردووەکە منداڵی لەپاش بەجێما بێ ئیتر چ مێینە و چ نێرینە ئینجا ئەگەر هیچ منداڵی نەبوو دەبوو باوك و دایکی میراتەکەی بگرن، سێ یەکی بۆ دایکی دەبێت، ئینجا هەروەك باوك و دایکی هەیە چەند براییەکیشی هەبوو دوان یان زیاتر ئەوە لەو حاڵەتەدا دایك شەش یەکی پێدەدەرێ و ئەوەی دەمێنێتەوە بۆ باوکەکەیە، مافی میراتبەرەکان دوای دانەوەی قەرز و قۆڵە و پێکهێنانی وەسیەتی مردووەکە دەدرێ، ئێوە نازانن لە باوانتانەوە و نەوە و کوڕەکانتان کامیان سوودی زیاترە بۆتان بڕیارێکە خوا خۆی دیاری کردووە بۆتان، بێگومان خوا خۆی هەمیشە زانایە و چاکە بۆ میراتبەرەکان).

* {وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُنَّ وَلَدٌ فَإِنْ كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ

الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِنْ لَمْ يَكُنْ لَكُمْ وَلَدٌ فَإِنْ كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُمْ مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ وَإِنْ كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَالَةً أَوِ امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ فَإِنْ كَانُوا أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ فَهُمْ شُرَكَاءُ فِي الثُّلُثِ مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَى بِهَا أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَارٍّ وَصِيَّةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ﴾ (النساء: ١٢)، واته: (لەو میراتە ژنانتان بە جێی دەهێڵن ئەگەر منداڵیان نەبێت، کوڕ یان کچ لە دوو بەش بەشێکتان دەکەوێت ئەگەر منداڵیشیان هەبوو ئێوە **«ئەی مێردەکان»** چواریەکتان دەکەوێت لەو کەلەپوورەی ئەو ژنانەتان بە جێیان هێشتووە ئەوەی تریشی وەك میراتبەرەکانی تر ئەبێت، ئەمانەش دوای ئەنجامدانی وەسیەتێك کردوویانە یان دانەوەی قەرز و قۆڵەیەك لەسەریانە، ژنەکانتان چواریەکی میراتتان دەگرن بەمەرجێك منداڵتان نەبێت، جا ئەگەر تەنها یەك ژنتان هەبوو هەموو چوار یەکەکە بۆ ئەو دەبێت، خۆ ئەگەر لە ژنێك زیاتر بوون ئەوا بەیەکسانی دابەش دەکرێت لە نێوانیاندا، خۆ ئەگەر منداڵیشیان هەبوو ژنانتان هەشتیەکی میراتەکەیان پێدەدرێت، پاش دانەوەی قەرزێك لەسەرتانە یان پێك هێنانی وەسیەتێك کردووتانە، خۆ ئەگەر پیاوێك یان ئافرەتێك مرد « باوك و باپیر و منداڵی نەبوو» بەڵکو برایەك یان خوشکێکی دایکی هەبوو هەریەکەیان شەشیەکی میراتەکەیان بۆ هەیە»بەبێ جیاوازی لە نێوان نێر و مێ دا»، ئەگەر برا و خوشکە دایکیەکە لەیەکێك زیاتر بوون هەموویان سێ یەکی کەلەپوورەکە دەبەن نێر و مێ بەیەکسانی، ئەو میراتیەش دوای پێك هێنانی وەسیەتێك یان دوای دانەوەی قەرزێك کە لەسەریەتی، نابێ وەسیەتەکە بە جۆرێك بێ زیان بەخشێت بۆ میراتگرەکان، ئەم بڕیارە لە خوداوە

دراوە ئەو خوایە ئەو بڕیارەی داوە بۆ خۆی دەزانێت چ شتێك چاكە و ئاگادار و لەسەرخۆیە).

* {يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلَالَةِ إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ وَهُوَ يَرِثُهَا إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهَا وَلَدٌ فَإِنْ كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ وَإِنْ كَانُوا إِخْوَةً رِجَالًا وَنِسَاءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ أَنْ تَضِلُّوا وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ} (النساء: ١٧٦)، واتە: (لێت دەپرسن: دەربارەی كەسێ باوك و منداڵی نی یە و دەمرێ، چی بكەن بە كەلەپوورەكەی؟ پێیان بڵێ خوا خۆی وەڵامتان دەداتەوە. (جا بۆ تەفسیری «كەلالە» هەندێ دەڵێن بە كەسێك دەڵێن كە نە باوك و نە منداڵی هەیە و دەمرێ، هەندێكی تر دەڵێن: ئەو كەسەیە تەنها منداڵی نەبێ و بمرێ)، ئەگەر كەسێك مرد و هیچ منداڵی نەبوو هەر تەنها خوشكێكی هەبێت ئەوا نیوەی میراتەكەی دەبا خۆ ئەگەر ئەو خوشكەكەش بمرێ و هیچ منداڵێكی لەپاش نەبوو ئەوا براكەی تەواوی میراتەكەی دەبا، خۆ ئەگەر هەر ئەو مردووە دوو خوشكی لێ بەجێمان، ئەوا دوو بەشیان لە سێ بەش بۆ هەیە، هەروەها ئەگەر لە دوو خوشك زیاتر بوون، خۆ ئەگەر چەند خوشك و چەند برایەك لەپاش مردووەكە جێمان و هیچ منداڵیشی نەبوو، ئەوا هەر نێرەی دوو ئەوەندەی مێینە میراتی بەردەكەوێ خوای گەورە ئەو یاسایەتان بۆ ڕووندەكاتەوە نەوەك لێتا تێك بچێ و مافی یەكتر زەوت بكەن، دیارە خواش بەهەموو شتێك زانایە).

لە زۆربەی حاڵەتەكاندا ئافرەت نیوەی میراتەكە هاوشانی پیاو وەردەگرێت،

هەرچەندە ئەمە لە هەموو حاڵەتێکدا وانیە، لە کاتێکدا کەسی مردوو هیچ نەوەیەکی لە دوای بەجێ نەماوە، بەڵام کوڕ یان کچ بەجێ بهێنێت هەر یەکێك لەو دوانە شەش یەکی میراتەکەیان بەردەکەوێت، لە حاڵەتی دیارو بەچاوی وەك ئەوەی کاتێك ئافرەتەکە دەتوانێ دوو ئەوەندەی پیاوەکە بەرێت ئەوەیە ئەگەر مردووەکە ئافرەت بێت و هیچ منداڵ یان کوڕ یان کچێکی نەبێتو تەنها هاوسەرو دایكو باوکی لە دوای بەجێمابێت، ئەوا هاوسەرەکەی نیوەی موڵکەکەی بەردەکەوێت، لەکاتێکدا دایکی سێ یەك و باوکی شەش یەکی بەردەکەوێت، لە حاڵەتی وەها تایبەتدا دایکەکە دوو ئەوەندەی باوکەکەی بەردەکەوێت، ئەوە ڕاستە کە وەکو یاسایەکی گشتی لە زۆرینەی بارودۆخەکاندا ئافرەت نیوەی پیاوی لە میراتی بە جێ ماودا بەردەکەوێت، بۆ نموونە لەم بارودۆخانەی خوارەوەدا:

**١- کچ نیوەی ئەو میراتەی بەردەکەوێت کە دەدرێت بە کوڕ.**

**٢- ئەگەر کەسی مردوو منداڵی لە دوا بە جێ مابێت؛ هاوسەر یەك لەسەر هەشتی پێدەدرێت، لە کاتێکدا پیاوەکەی یەك لەسەر چوار.**

**٣- ئەگەر کەسی مردوو هیچ منداڵێکی نەبێت؛ هاوسەر یەك لەسەر چواری پێدەدەرێت، لە کاتێکدا پیاوەکەی یەك لەسەر دوو.**

## ٤- ئەگەر کەسی مردوو هیچ نەوە و کوڕەزایەکی نەبوو؛ ئەوا خوشك نیوەی بەشی براکەی پێدەدرێت.

لە ئیسلامدا ئافرەت هیچ ئەرکێکی ئابووری و دارایی لەسەر شان نییە، ئافرەت پێش ئەوەی شوو بکات ئەوا ئەرکی لەسەر برا و باوکییەتی بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی و، پێدانی خەرجی جلوبەرگ و ڕۆژانەی، دوای ئەوەی شوو دەکات ئەو ئەرکەی لەسەر باوك و برای دەگوازرێتەوە بۆ سەر شانی پیاوەکەی یان کوڕەکەی.

ئیسلام پڕکردنەوەی تەواوی پێداویستییەکانی خێزانی خستووەتە ئەستۆی پیا، بۆ ئەوەی بتوانێت ئەو پێداویستییانە پڕبکاتەوە ئەوا دوو هێندەی بەشی ژنی بەردەکەوێت لە میراتی. بۆ نموونە ئەگەر پیاوێك بمرێت لە دوای خۆی (١٥٠٠٠٠ روپیە) بۆ منداڵەکانی (کوڕ و کچێك) بەجێبهێڵێت؛ ئەوا کوڕەکە (١٠٠٠٠٠ روپیە) و کچەکەش (٥٠٠٠٠ ڕوپیە)ی بەردەکەوێت، چونکە ئەرکەکانی ماڵەکە دەکەوێتە سەر شانی کوڕەکە و، ڕەنگە تەواوی ئەو میراتییەی کە بەریکەوتووە لە خزمەتی ماڵەکەیدا خەرجی بکات و، لە (٢٠٪)ی بۆ بمێنێتەوە، لەلایەکی تر کچەکە کە (٥٠٠٠٠ روپیە)ی بەرکەوتووە کەس زۆری لێناکات، تەنانەت یەك تۆزیش لەو پارەیە سەرف بکات، دەتوانێت هەمووی هەڵبگرێت، تۆ ئەو میراتییەت پێ باشە کە لە (١٠٠٠٠٠ روپیە)دا (٨٠٠٠٠)ی سەرف بکەیت، یان (٥٠٠٠٠ روپیە)ت بەربکەوێت و هەمووی هەڵبگریت؟

# پرسیاری شانزەهەم / ژیانی دوای مردن

## چۆن ژیانی دوای مردن بسەلمێنین؟

## وەڵام/

### ١- باوەڕبوون بە ژیانی دوای مردن لە سەر باوەڕێکی کوێرانە بنیات نەنراوە:

زۆر خەڵك پێیان سەیرە چۆن کەسێك کە مۆرکێکی زانستی و ئەخلاقی هەبێت بڕوا بە ژیانی دوای مردن دەکات، خەڵکی وا دادەنێت کە هەرکەسێ بڕوا بە ژیانی دوای مردن بکات، ئەوا لەسەر بنەمای باوەڕبوونێکی کوێرانەیە، بڕوای من بە ژیانی دوای مردن لەسەر وتووێژێکی ئاقڵانە بنیاتنراوە.

### ٢- ژیانی دوای مردن بڕوایەکی ئاقڵانەیە:

زیاتر لە هەزار ئایەت لە قورئانی پیرۆز هەیە کە ڕاستی زانستی تێدایە، هەندێك لەو ڕاستییانەی کە لە قورئاندا ئاماژەی پێکراوە لەم چەند سەدەی ڕابردوودا سەلمێنراون، بەڵام زانست هێندە پێش نەکەوتووە تاکو هەموو دەقەکانی قورئان بسەلمێنێت. وادابنێ (٨٠٪)ی هەموو ئەوانەی لە قورئاندا ئاماژەی پێکراوە سەلمێنراون و (١٠٠٪) ڕاست بوون و، نزیکەی (٢٠٪)ی ماوە تاکو تەواوی ڕاستییەکەی بسەلمێنرێت، لەگەڵ ئەو زانیارییە سنووردارەی کە ئێمە هەمانە ناتوانین بڵێین کە دڵنیابین لەوەی تەنانەت ڕێژەیەکی کەم لەو (٢٠٪)ی یان ئایەتێکی هەڵەیە، هەرچەندە (٨٠٪)ی

قورئان (١٠٠٪) ڕاسته و، له (٢٠٪) تا ئێستا نه‌سه‌لمێنراوه‌، لۆژیك ئه‌وه‌مان پێده‌ڵێت كه‌ ئه‌و (٢٠٪)ه‌ش ڕاسته‌، هه‌بوونی ژیانی دوای مردن له‌ قورئاندا ئاماژه‌پێكراوه‌ ده‌كه‌وێته‌ ئه‌و (٢٠٪) ناڕوونه‌ كه‌ لۆژیك به‌ ڕاست له‌قه‌ڵه‌می ده‌دات.

## ٣- چه‌مكی ئاشتی و به‌های مرۆڤ بێ سووده‌ به‌ بێ چه‌مكی ژیانی دوای مردن:

ئایا دزیكردن كارێكی باش یان خراپه‌؟ كه‌سێكی ئاسایی ڕه‌نگه‌ بڵێت ئه‌وه‌ دزیكردنه‌ كارێكی خراپه‌، چۆن كه‌سێك كه‌ باوه‌ڕی به‌ ژیانی دوای مردن نییه‌ ده‌توانێت قه‌ناعه‌ت به‌ تاوانبارێكی به‌ ده‌سه‌ڵات و كاریگه‌ر بكات كه‌ دزیكردن كارێكی خراپه‌؟ وا دابنێ كه‌ من به‌هێزترین و كاریگه‌رترین تاوانباری سه‌ر زه‌ویم، له‌ هه‌مانكاتیشدا كه‌سێكی زیره‌ك و لۆژیكیم، من ده‌ڵێم دزیكردن باشه‌، چونكه‌ واده‌كات كه‌ ژیانێكی خۆشم هه‌بێت، ئه‌گه‌ر هه‌ر كه‌سێك خاڵێكی لۆژیكیم له‌به‌رده‌م دابنێت له‌وه‌ی بۆچی دزیكردن كارێكی خراپه‌ بۆ من، من ڕاسته‌وخۆ ئه‌و كه‌سه‌ ده‌وه‌ستێنم به‌م خاڵانه‌ی لای خواره‌وه‌:

## یه‌كه‌م: ئه‌و كه‌سه‌ی كه‌ دزی ده‌كات تووشی ناڕه‌حه‌تی ده‌بێته‌وه‌.

هه‌ندێك ڕه‌نگه‌ بڵێن ئه‌و كه‌سه‌ی كه‌ دزی ده‌كات تووشی ناڕه‌حه‌تی و زه‌حمه‌ت ده‌بێت، من به‌ دڵنیاییه‌وه‌ ڕازیم به‌وه‌ كه‌ زۆر خراپه‌ بۆ كه‌سێك كه‌ دزی بكات، به‌ڵام دزیكردن بۆ من باشه‌، ئه‌گه‌ر من هه‌زار دۆلار بدزم

ئەوا دەتوانم لە ڕیستۆرانتێکی پێنج ئەستێرەیی ژەمێکی باش بخۆم.

## دووەم: ئەی ئەگەر کەسێك دزی لە تۆ بکات؟

هەندێك کەس مناقەشەی ئەوە دەکەن کە ڕەنگە ڕۆژێك دزیش لەمن بکرێت، بەڵام کەس ناتوانێت دزی لەمن بکات، چونکە من تاوانبارێکی زۆر بە دەسەڵاتم سەدان پاسەوانی تایبەتیم هەیە، من دەتوانم لە هەرکەسێك کە بمەوێت دزی لێبکەم، بەڵام کەس ناتوانێت ئەو کارە لەگەڵ من بکات، چونکە کەس ناتوانێت دزی لە دزێکی شارەزای وەك من بکات.

## سێیەم: ڕەنگە پۆلیس دەستگیرت بکات.

ڕەنگە هەندێك کەس بڵێن ئەگەر دزی بکەیت ئەوا لە لایەن پۆلیسەوە دەستگیر دەکرێیت. لێرەدا من دەڵێم کە پۆلیس ناتوانێت من دەستگیر بکات، چونکە پۆلیس مووچەی خۆی هەیە لەلای من و، تەنانەت مووچە بە وەزیریش دەدەم، من لەگەڵ ئەوەدام ئەگەر کەسێکی ئاسایی دزی بکات دەستگیر دەکرێت و پۆلیس خراپی بەسەر دەهێنێت، بەڵام ناتوانن ئەو کارە بەرامبەر بە من بکەن، چونکە من تاوانبارێکی بە دەسەڵاتم. کەواتە یەك هۆکارم پێ بڵێ کەوا لەمن بکات کە دەست لە دزی هەڵبگرم.

## چوارەم: پارەیەکی ئاسانە.

هەندێك دەڵێن دزیکردن پارەیەکی ئاسانت وەچنگ دەخات، ئەوەش یەکێکە لەو هۆکارانەی کە وا دەکات دزی بکەم، ئەگەر کەسێك دوو بژاردەی لەبەردەست بێت بۆ پارە پەیداکردن یەکێکیان ئاسان و ئەویتریان

قورس، کامەیان هەڵدەبژێریت؟ بەدڵنیاییەوە ئاسانەکە.

### پێنجەم: ئەوە دژی مرۆڤایەتییە.

هەندێك پێم دەڵێن کە دزیکردن دژ بە مرۆڤایەتییە و مرۆڤ دەبێت ئاگاداری مرۆڤەکانی تر بێت، من پرسیار دەکەم کێ ئەو یاسایەی داناوە کە ناونراوە «مرۆڤایەتی»؟ من بۆچی پەیڕەوی ئەو یاسایە بکەم؟ ئەو یاسایە ڕەنگە بۆ کەسانی بەسۆز باش بێت، بەڵام من کەسێکم کە بەرژەوەندی و قازانجەکانم پێش گرنگیدان بە مرۆڤەکان دادەنێم.

### شەشەم: دزیکردن کارێکی خۆ پەرستانەیە

ڕەنگە هەندێك کەس بڵێن کە دزیکردن کارێکی خۆ پەرستانەیە، منیش هاوڕام لەگەڵیاندا، بەڵام بۆچی من خۆپەرست نەبم؟ دزیکردن یارمەتیم دەدات ژیانێکی خۆشم هەبێت و چێژی لێ ببینم.

### ٤- هیچ هۆکارێکی لۆژیکی نییە بۆ دزیکردن تا کارێکی خراپ بێت.

هەرچەندە هەموو ئەو گفتوگۆیانەی کە هەوڵیان دەدا بیسەلمێنن کە دزیکردن کارێکی خراپە بێ سوودبوون، ئەو گفتوگۆیانە ڕەنگە باوەڕ بە کەسێکی سادە بهێنن، بەڵام ناتوانن باوەڕ بە کەسێکی بە دەسەڵات و کاریگەری وەك من بکات، هیچ کام لەم مناقەشانە ناتوانن ڕێگری لە هێزی مێشك و لۆژیك بکەن، جێی سەرسوڕمان نییە کە زۆر تاوانبار هەن لە جیهاندا؛ کە دەستدرێژی سێکسی... هتد دەکەن و، وەکو کەسێکی باش

پۆلێن دەکرێن.

## ٥- موسوڵمانێك دەتوانێت قەناعەت بە تاوانبارێکی بە دەسەڵات بکات.

ئێستا با بیرۆکەکان بگۆڕین، وادابنێ تۆ تاوانبارێکی بەدەسەڵاتیت لە جیهاندا کە پۆلیس و وەزیرەکان مووچەت لێ وەردەگرن و، سوپاش هەیە تا بتپارێزێت، منیش موسوڵمانێکم کە بڕوات پێدەهێنم کە دزیکردن و لاقەکردن و فێڵکردن ...هتد کاری خراپن، ئەگەر من وتووێژەکان بەرەو پێش ببەم بۆ ئەوەی بیسەلمێنم کە ئەو کارانە خراپن؛ ئەوا تاوانبارەکە بەهەمان شێوەی پێشتر وەڵامم دەداتەوە. من هاوڕام لەگەڵ ئەوەی کە تاوانبارەکە لۆژیکی بوو لە هەموو گفتوگۆکانیدا و ڕاست بوو، ئەگەر کاتێك کە ئەو تاوانبارێکی بە دەسەڵات و تاوانبار بێت.

## ٦- هەموو مرۆڤێك دادپەروەری دەوێت:

هەموو مرۆڤێك ئارەزووی دادپەروەری دەکات، تەنانەت ئەگەر بۆ کەسانی تریشی نەوێت ئەوا بۆ خۆی دەیەوێت، هەندێك کەس مەست بوون لە دەسەڵاتدا و ئازار چەشتن دەسەپێنن بەسەر ئەوانی تردا، هەمان ئەو خەڵکانە بەرهەڵستی دەردەبڕن کاتێك کارێکی نادادپەروەرانە بەرامبەر بەخۆیان ئەنجام دەدرێت، هۆکاری ئەوەی کە ئەو خەڵکانەی کە بێ هۆش و بێ ئاگا دەبن بەرامبەر بە ئازارچەشتنی کەسانی تر؛ ئەوا بەهۆی پەرستنی دەسەڵاتەوەیە، ئەو دەسەڵات و کاریگەرییەی کە خۆیان هەستی پێ دەکەن، نەك ڕێگە دەگرێت لەوەی کە نادادپەروەری بەسەر خەڵکدا

بسەپێنێت، بەڵکو خۆیانی پێ لە خەڵکانی تر دەپارێزن کە نادادپەروەر بن بەرامبەریان.

## ٧- خوا بەهێزترین و دادپەروەرترینە:

من وەکو موسوڵمان ڕەنگە باوەڕ بە تاوانبار بهێنم سەبارەت بە هەبوونی خوا (بە ئاماژەکردن بۆ ئەو وەڵامانەی کە بوونی خوا دەسەلمێنن) کە ئەو خودایە بەهێزتر و دادپەروەرترە لە تۆ، لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە دەفەرموێت:

«بەراستی خوا بەقەدەر تۆزقاڵێك ستەم (لەئادەمیزاد) ناکات، خۆ ئەگەر چاکەیەك هەبێت (بەرەکەتی بەسەردا دەڕژێنێت و) چەند بەرابەری دەکات و لەلایەنی خۆیەوە پاداشتی گەورە و بێ سنوور دەبەخشێت (بەچاکەخوازان)» (٤٠/٤).

## ٨- بۆچی خوا سزام نادات:

ئەگەر کەسی تاوانبار کەسێکی لۆژیکی و زانستی بێت هاوڕایە لەگەڵ ئەوەی کە خوا بوونی هەیە دوای ئەوەی کە ڕاستییە زانستییەکانی قورئان سەبارەت بە بوونی خوای بۆ دەخەینەڕوو، بەڵام ڕەنگە هەندێك جار مناقەشەی ئەوە بکات ئەگەر خوا هێندە بە دەسەڵات و دادپەروەرە ئەی بۆچی سزای من نادات؟

## ٩- ئەو کەسانەی کە کاری ناداد پەروەرانە دەکەن دەبێت سزا بدرێن:

هەموو کەسێك لەو کەسانەی کە دەناڵێنن بەدەست نادادپەروەری و خراپی باری دارایی و کۆمەڵایەتی، بە دڵنیاییەوە دەیانەوێت کە تاوانبارانی نادادپەروەری سزا بدرێن، هەموو کەسێکی سادە ئاواتەخوازە کە کەسانی دز و خراپەکار دەرسێکیان دابدرێت، هەرچەندە ژمارەیەکی زۆر لە تاوانبارەکان سزادراون هێشتا زۆریان ماوە کە سزا نەدراون و بووراون لە هەموو باجێك، ئەوان ژیانێکی خۆش و ئاسوودە دەژین تەنانەت زۆر بە سەربەستانە دەژین، ئەگەر نادادپەروەری کرا بەرامبەر کەسێکی خاوەن دەسەڵات لەلایەن کەسێکەوە کە لەو دەسەڵاتی زیاتر بێت؛ ئەوە ئەوانیش دەیانەوێت کە تاوانکارانی نادادپەروەری سزا بدرێن.

## ١٠- ژیان تاقیکردنەوەیە بۆ ژیانی دوای مردن:

ژیان تاقیکردنەوە و هەڵسەنگاندنە بۆ ژیانی دوای مردن، وەکو لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە دەفەرموێت: {الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ} (الملك: ٢)، واتە: (ئەو خوایەی کە مردن و ژیانی دروستکرد، بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە کامەتان کار و کردەی چاکتر و باشترە پاشانیش بە پێی ئەوە پاداش وەرگرێتەوە، وە تەنها ئەو دەسەڵاتدارە).

١١- دادپەروەریی کۆتایی لە ڕۆژی دواییدا، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: {كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَمَنْ

زُحْزِحَ عَنِ النَّارِ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا مَتَاعُ الْغُرُورِ} (آل عمران: ١٨٥)، واته: (هەموو کەسێك بێ جیاوازی تامی مردن دەچێژێ، ڕۆژی قیامەت گشت کرێ و پاداشی خۆتانتان دەدرێتەوە، ئینجا هەرکەسێ لە ئاگر دوورخرایەوە برایە بەهەشتەوە بێ شك سەرفراز و سەرکەوتوو دەبێت، ژیانی ئەم دونیایەش تەنیا خۆشی و لەزەتێکی کەم و چەواشەکار و فریودەر و خشتەبەرە کەواتە وشیاربن).

دادپەروەریی کۆتایی لە ڕۆژی دوایی دێت، دوای ئەوەی کە کەسێك دەمرێت لە ڕۆژی دواییدا لەگەڵ هەموو مرۆڤەکانی تر زیندوو دەبێتەوە، گونجاوە ئەگەر کەسێك بەشێك لە سزاکانی وەربگرێت لە دونیادا، پاداشت و سزای کۆتایی تەنها لە ڕۆژی دواییدا دەبێت، ڕەنگە خوای گەورە لە دونیادا سزای دزێك یان کەسی خراپەکار نەدات، بەڵام بە دڵنیاییەوە لە ژیانی دوای مردن بە سزای خۆی دەگات.

## ١٢- چ جۆرە سزایەکی مرۆڤ بەسەر هیتلەر دەسەپێنرێت:

هیتلەر لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی خۆیدا شەش ملیۆن جولەکەی کرد بە خۆڵەمێش، ئەگەر پۆلیس دەستگیری بکردایە چ سزایەك دەسەپێنرا بەسەر هیتلەردا؟ زۆرترینی ئەوەی کە دەیانتوانی بیکەن ئەویش دانانی هیتلەر لەناو ژووری گازدا تاکو دەمرد، بەڵام ئەم سزادانە لەبەرامبەر کوشتنی یەك جولەکەیە، ئەی چی سەبارەت بە سزای کوشتنی پێنج ملیۆن و نۆسەد و نەوەد و نۆ هەزار و نۆسەد و نەوەد و نۆ جولەکەکەی تر؟

١٣- خودا دەتوانێت لە ئاگری دۆزەخدا زیاد لە شەش ملیۆن جار هیتلەر بسوتێنێت، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: {إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا} (النساء: ٥٦)، واتە: (بێگومان ئەو کەسانەی بە ئایەت و نیشانەکانی ئێمە بێباوەڕن لە دوارۆژدا دەیانبەینە ناو ئاگرێکی بڵێسەدار و گەرمەوە ئەیانبرژێنێ هەرجارەی کە پێستی جەستەیان داپڵخا و سوتا، چەند پێستێکی تریان بۆ ئەگۆڕین لە جێی ئەودا تا پتر ئەو سزایە بچێژن، بەڕاستی خوا دەسەڵاتداری کاردروستە هەرگیز لە خۆوە سزای هیچ کەسێك نادات)، ئەگەر خوا بیەوێت ئەوا زیاتر لە شەش ملیۆن جار هیتلەر لە ئاگری دۆزەخدا دەسووتێنێت.

## ١٤- هیچ چەمکێکی بەهای مرۆڤ و باش و خراپ نییە؛ بە بێ چەمکی ژیانی دوای مردن:

ئەوە ڕوونە بێ باوەڕهێنانی کەسێك سەبارەت بە ژیانی دوای مردن؛ چەمکی بەهای مرۆڤ و سروشتی باش و خراپ شتێکی ئەستەمە، بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت ئەوەی کە دەیکات نادادپەروەرانەیە، بە تایبەت کاتێك ئەو کەسە دەسەڵاتدار و کاریگەر بێت.

# پرسیاری حەڤدەهەم

## بۆچی موسوڵمانان دابەشبوون بەسەر چەندین ڕێباز و قوتابخانەی فیکری جیاوازدا؟

**لە کاتێکدا موسوڵمانان بڕوایان بەیەک خوا هەیە و، شوێنکەوتەی یەک قورئانن، باشە بۆچی چەندین ڕێباز و چەندین قوتابخانەی فیکری جیاواز لە نێوانیاندا هەیە؟**

## وەڵام/

### ١- دەبێت موسوڵمانان یەکگرتوو بن:

ئەوە ڕاستییە کە موسوڵمانان ئەمڕۆ دابەشبوون لەنێوان خۆیاندا، تراژیدیاکە لەوەدایە کە ئەو جۆرە دابەشبوونە لەلایەن ئیسلامەوە پاڵپشتی ناکرێت، ئیسلام بڕوای بە یەکگرتوویی و یەکێتی هەیە لەنێوان شوێنکەوتووانی، قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: {وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا وَاذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنْتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُمْ بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا وَكُنْتُمْ عَلَى شَفَا حُفْرَةٍ مِنَ النَّارِ فَأَنْقَذَكُمْ مِنْهَا كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ} (آل عمران : ١٠٣)، واتە: (بە تێکڕا گشتان دەست بە ڕشتەی ئاینی خوا و قورئانەکەیەوە بگرن و قەت لێی نەترازێن و کارێك مەکەن ببێتە هۆی پەرت بوونتان، بەخشش و نیعمەتەکانی خوا وەبیربێنن، ئەو دەمە کە ئێوە لەسەردەمی نەفامیدا دژ بەیەکتربوون ئینجا خوا بەبەزەیی هۆگری و تەبایی خستۆتەوە نێوان دڵەکانتانەوە، ئەوجا ئێستا بەهۆی بەخشش و

میهرەبانی خۆیەوە بوونە برا و کینەی چەندین ساڵە لە دڵتان دەرچوو، ئەو کات ئێوە لەسەر لێواری چاڵێکی پڕ لە ئاگر بوون و ڕزگاری کردن لێی، خوا بەو شێوەیە جوانە ئایەتەکانی روون دەکاتەوە بۆتان بەشکو رێی ڕاست بدۆزنەوە و ڕێنوێن بن).

چ جۆرە حەبلێك خوای گەورە مەبەستیەتی لەم ئایەتەدا؟ خوای گەورە مەبەستی لەو حەبلە «خودایە» کە هەموو موسوڵمانان پێویستە بە توندی دەستی پێوەبگرن، لەم ئایەتەدا دووجار دووپاتکردنەوە هاتووە لەگەڵ ووتنی»هەموو پێکەوە دەستی پێوەبگرن»، هەروەها دەفەرموێت «نابێت دابەش بن»، لە ئایەتێکی تردا هاتووە خوای گەورە دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ...} (النساء: ٥٩)، **واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەر بن لە هەموو کاروبارێکدا وە گوێڕایەڵی کاربەدەستان و کارسازانی خۆتان بن، وە ئەگەر کێشەتان هەبوو ئەوا بیگێڕنەوە بۆ لای خوا و پێغەمبەر...).** کەوابوو نابێت بە هیچ جۆرێك کێشەکانتان بەرنە لای تاعونەکانی سەردەم، هەموو موسوڵمانان پێویستە شوێنکەوتەی قورئان و فەرموودەبن و نابێت دابەش بن لەنێوان خۆیاندا.

## ٢- دروستکردنی ڕێباز و بەش قەدەغەیە لە ئیسلامدا:

خودا لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: {إِنَّ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا لَسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ إِنَّمَا أَمْرُهُمْ إِلَى اللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُمْ بِمَا كَانُوا يَفْعَلُونَ} (الأنعام:

١٥٩)، واتە: (بێگومان ئەو کەسانەی دینی خۆیانیان پەرت و بڵاوکرد و بوونە چەند دەستە و بەستەیەکی جیاواز و لێکترازاو، تۆ کارێکت بەوان نیە، بەڕاستی بڕیاری چارەنوسیان هەر لای خوایە پاشانیش بە هەکارێ کردوویانە ئاگاداریان دەکات). لەم ئایەتەدا هاتووە کە پێویستە هاوکاری ئەوانە نەکەین کە ئایینەکە دابەش دەکەن بۆ چەند بەش و ڕێبازێك، بەڵام کاتێك یەکێك پرسیار لە موسوڵمانێك دەکات و لێی دەپرسێت: **«تۆ کێیت؟»** وەڵامی باویان ئەوەیە: **«دەڵێ من سوننەم یان شیعەم»** هەندێك ناویان لەخۆ ناوە حەنەفی یان شافیعی، یان مالیکی یا حەمبەلی، هەندێکی تر دەڵێن: دیوبەندی لە کاتێکدا هەندێکی تر بە خۆیان دەڵێن: بارڤیلی.

## ٣- پێغەمبەرەکەمان موسوڵمان بووە:

کەسێك ڕەنگە پرسیاری ئـەوە بکات لە موسوڵمانان پێغەمبەری خۆشەویستمان کێیە؟ ئایا ئەو حەنەفی یان شافعی یان حەمبەلی یان مالیکی بووە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر، ئەو موسوڵمان بووە، هاوشێوەی هەموو پێغەمبەر و پەیامبەرەکانی تری خودا، لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە: {فَلَمَّا أَحَسَّ عِيسَى مِنْهُمُ الْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنْصَارِي إِلَى اللَّهِ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنْصَارُ اللَّهِ آمَنَّا بِاللَّهِ وَاشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ} (آل عمران: ٥٢)، واتە: (ئینجا هەر کە عیسا هەستی کرد ئەوان باوەڕی پێناکەن وتی کێ بێ لەبەر خوا یار و یاوەرم بێت پەیڕەوی لە دینەکەی بکەین، شاگردە دڵسۆز و پاڵاوتەکانی ووتیان هەر خۆمانین لەبەر ئایینی خوا یاریدەدەرین بە تەنها ئامادەین خۆ بەخت بکەین بۆ خوا باوەڕی دامەزراومان بە خوا هێناوە و تۆش شایەت بە عیسا کە بەڕاستی ئێمە موسوڵمان و ملکەچی فەرمانی

خواین).
لەقورئاندا، لەسوورەتی (ئَل عمران)دا هاتووە کە عیسا پێغەمبەر (علیە السلام) موسوڵمان بووە و، لە ئایەتی (٦٧)ی هەمان سوورەتدا هاتووە کە ئیبراهیم پێغەمبەر (علیة السلام) مەسیحی یان جولەکە نەبووە، بەڵکو ئەویش موسوڵمان بووە: {مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَكِنْ كَانَ حَنِيفًا مُسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ} (آل عمران: ٦٧)، واتە: (دڵنیا بن کە ئیبراهیم نە جولەکە و نەگاور بوو بەڵکو یەکتا پەرست و ملکەچ و ڕاساڵ و موسوڵمانێك بوو تەنها ساتێکیش لە هاوبەش پەیداکەران نەبووە).

## ٤- قورئان دەفەرموێت هەمووتان بە خۆتان بڵێن موسوڵمان:

**یەکەم:** ئەگەر کەسێك ئەو پرسیارە لە موسوڵمان بکات و لێی بپرسێت تۆ کێیت؟ ئەوا پێویستە لە وەڵامدا بڵێت من موسوڵمانم نەك حەنەفی ...هتد: {وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِمَّنْ دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ}. (فصلت: ٣٣)، واتە: (کێ لەو کەسە قسەی جوانترە خەڵك بەرەو یەك خوا ناسی و بۆ ئیسلام کردنە پەیڕەو و پرۆگرام بانگ دەکات، وە کردەوەی چاکیش دەکات و بە شانازی یەوە دەڵێت»من یەکێکم لە موسوڵمانان»).

**دووەم:** پێغەمبەر لە کاتی ناردنی نامە بۆ پاشا و فەرمانڕەوا ناموسوڵمانەکان بەمەبەستی بانگهێشتکردنیان بۆ سەر ئایینی ئیسلام، لەو نامانەدا هاتووە و لە قورئانی پیرۆزدا باسکراوە: {قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا

مِنْ دُونِ اللَّهِ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ} (آل عمران: ٦٤)، واته: (ئەی پێغەمبەر بە خاوەن نامەکان بڵێ وەرن با ئێمە و ئێوە لەسەر وشە و بەرنامەیەك سوور بین کە بۆ هەردوو لامان چوونیەکە و یەکسانە، وەرن با جگە لە خوا کەسی تر نەپەرستین و هیچ شتێکیش نەکەینە شەریك و هاوبەش، هەندێکیشمان لە جیاتی خوا نەکەینە خوا و بپەرسترێن، ئینجا ئەگەر هەر ڕوویان لەو قسە ڕاستیە وەرگێڕا و بۆ یەکتا پەرستی نەهاتن بە دەمتانەوە، بە ڕاشکاوی پێیان بڵێن دەسا ئێوە بە شایەت بن بزانن کە بە ڕاستی ئێمە موسوڵمان و ملکەچی بڕیارەکانی خواین).

## ٥- ڕێز لە هەموو زانایانی ئیسلام بگرە:

پێویستە ئێمە ڕێز لە هەموو زانایانی ئیسلام بگرین لە نێوانیاندا چوار پێشەوا لەوانە پێشەوا؛ ئەبو حەنیفە، پێشەوا شافعی و، پێشەوا حەمبەل و، پێشەوا مالك (خوای گەورە لێیان ڕازی بێت)، ئەوان توێژەر و یاسازانی گەورەی ئیسلام بوون، خوا خۆی پاداشتیان بداتەوە بۆ لێکۆڵینەوەی کارەکانیان، کەسێکە ناتوانێت بەرهەڵستی بکات ئەگەر کەسێك ڕازی بن لەگەڵ دیدەکان و لێکۆڵینەوەکانی پێشەوا ئەبو حەنیفە و پێشەوا شافعی ...هتد بۆ کاتێك ڕووبەڕووی ئەو پرسیارە دەبێتەوە کە تۆ کێیت؟ ئەوا پێویستە وەڵامەکە «من موسوڵمانم» بێت.

ڕەنگە هەندێك مناقەشەی ئەوە بکەن بە هێنانەوەی فەرموودەیەکی پێغەمبەرمان **(صلى الله عليه وسلم)** لە سونەنی ئەبو داوددا لە ژمارە (٤٥٧٩) لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەر **(صلى الله عليه وسلم)** ڕایگەیاندووە کە: «ئومەتەکەم پەرت دەبێت بۆ ٧٣ ڕێباز» ئەم فەرموودەیە

ئەوە ڕادەگەیەنێت کە پێغەمبەر پێشبینی کردووە کە کۆمەڵگای ئیسلامی ببێت بە (٧٣) ڕێباز، ئەو نەیفەرمووە کە موسوڵمانان دەبێت چالاك بن لە دابەشبوون.

قورئانی پیرۆز فەرمانی ئەوەمان پێدەکات کە بەش و ڕێباز لە ئایینی ئیسلامدا دروست نەکەین، ئەوانەی کە شوێنکەوتە و پەروەردەی قورئان و فەرموودەی صەحیحن و بەش نەبوون؛ ئەوا ئەوان لەسەر ڕێگای ڕاستین، بە گوێرەی فەرموودەیەکی تری ژمارە (١٧١) پێغەمبەر فەرموویەتی: «ئومەتەکەم بەش دەبێت بۆ (٧٣) ڕێباز و هەمووشیان لە ئاگری دۆزەخدا دەبن جگە لە یەك ڕێباز، هاوەڵەکانی لە پەیامبەری خوایان پرسی کام ڕێبازەیە؟ پێغەمبەری خوا (د.خ) لەوەڵامدا فەرمووی: ئەو ڕێبازەی کە من و هاوەڵەکانی لەسەرە».

لە قورئانی پیرۆزدا لە چەند ئایەتێکدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە: «گوێڕایەڵی خوا و پەیامبەری خوا بن» موسوڵمانی ڕاستەقینە پێویستە تەنها شوێنکەوتەی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی صحیح بێت، دەتوانیت هاوڕابیت لەگەڵ هەموو زانایەکی ئیسلام تا ئەو کاتەی لەگەڵ قورئان و فەرموودەی صحیحدا یەك دەگرنەوە، ئەگەر ئەو هاوڕابوونە لەدژی قسەی خوا و سوننەتی پێغەمبەر (د.خ) بێت ئەوا هیچ بەهایەکی نییە، بێ گوێدانە ئەوەی کە ئەو زانایە چەندی زانیبێت، بەویستی خوا زۆرینەی جیاوازییەکان و کێشەکان چارەسەر دەبن و دەتوانین ئوممەتێکی موسوڵمانی یەکگرتوومان هەبێت.

# پرسیاری هەژدەهەم

## هەموو ئایینەکان داوا لە مرۆڤ دەکەن کە کەسی باش بن، بۆچی دەبێت مرۆڤەکان تەنها پەیڕەوی ئایینی ئیسلام بکەن؟

**هەموو ئایینەکان بە شێوەیەکی سەرەکی شوێنکەوتووانی دادپەروەر دەکات کە کاری باش بکەن، بۆچی دەبێت تەنها شوێنکەوتەی ئایینی ئیسلام بین؟**

## وەڵام/

**١- جیاوازی سەرەکی نێوان ئایینی ئیسلام و زۆربەی ئایینەکانی تر:**

هەموو ئایینەکان بەشێوەیەکی سەرەکی داوا لە مرۆڤ دەکات کە کەسانی باش بن و لە کاری خراپ دووربکەونەوە، بەڵام ئیسلام لەسەروو ئەوانەوە کاردەکات، ئیسلام ڕێبەریمان دەکات بۆ ڕێگای دیار بۆ ئەنجامدانی کاری باش و سڕینەوەی کاری خراپ لە نێوان تاکەکان و کۆمەڵدا، ئیسلام دەچێتە ناو سروشتی کۆمەڵگای ئاڵۆزی مرۆڤەکان، ئیسلام ڕێنوێنی خۆ دروستکردن دەکات، هەربۆیە بە ئایینی ئیسلام دەوترێت: «ئایینی سروشتی مرۆڤ».

## ٢- ئیسلام فەرمانمان پێ دەکات کە خۆمان بەدووربگرین لەدزیکردن و، چۆنیەتی لەناوبردنی دزیکردنمان بۆ باسدەکات.

**یەکەم: ئیسلام وەسفی چۆنیەتی لەناوبردنی دزیکردن دەکات:**

هەموو ئایینە سەرەکییەکان شوێنکەوتووانیان دادپەروەر دەکەن کە دزیکردن کارێکی خراپە، ئیسلامیش بەهەمان شێوە. کەواتە جیاوازی چییە لەنێوان ئیسلام و ئایینەکانی تر؟ جیاوازییەکە دەکەوێتە سەر ئەو ڕاستییەی کە ئیسلام لەگەڵ ئەوەی کە موسوڵمانان وا فێردەکات کە دزیکردن کارێکی خراپە، ڕێگایەکی پراکتیکیشمان نیشان دەدات لە دروستکردنی پێکهاتەی کۆمەڵگایەك کە دزی تێدا نەکرێت.

**دووەم: ئیسلام باسی زەکات دەکات:**

ئیسلام وەسفی سیستەمی زەکات دەکات کە بەخشیشێکی ساڵانەی ناچارییە:

یاسای ئیسلام باسی ئەوە دەکات کە هەموو کەسێك کە پارەی لە خۆی زیاتری پاشەکەوتکردووە، بەڕێژەیەك کە زیاتر لە (٨٥)گرام ئاڵتون؛ ئەوا پێویستە (٢,٥٪)ی ببەخشێت، ئەگەر هەموو کەسە دەوڵەمەندەکانی دونیا بە دڵسۆزانە زەکات ببەخشن ئەوا هەژاری لەسەر زەوی نامێنێت و نهیچ کەسێك لە دونیادا نابێت کە لە برساندا بمرێت.

**سێیەم: ئەو دەرئەنجامانەی کە لە ئەنجامی جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلامەوە وەدەست دێت:**

ئەمەریکا بەیەکێك لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی دونیا دادەنرێت ناخۆشبەختانە بەرزترین ڕێژەی کوشتن و دزیکردن و تاڵانکردنی تێدا تۆمارکراوە، وا دابنێ ئەگەر شەریعەتی ئیسلام لە ئەمەریکا جێبەجێ بکرێت، یان بە مانایەکی تر هەموو دەوڵەمەندەکانی ئەمریکا (٢,٥٪)ی بیبەخشێت لەسەرو (٨٥*گرام ئاڵتونەوە کە پاشەکەوتیانکردووە و، هەموو دز و تاڵانکارییەکان دەستیان ببڕدرێت وەکو سزایەك، ئایا ئەو کات دزیکردن لە ئەمەریکا نزم دەبێتەوە یان بەرز؟ بە سروشتی ڕێژەکە کەم دەبێتەوە. من هاوڕام لەگەڵ ئەوەی دەستبڕینی دزەکان جێبەجێ بکرێت ئەوا ملیۆنان کەس بێ دەست دەبن، مەبەستەکە لێرەدا ئەوەیە کە ڕێژەی دزیکردن زۆر کەم دەبێتەوە.

دزەکان جوانتر بیر لە کرداری دزیکردنەکە دەکەنەوە پێش ئەوەی یەکێك دەستەکانی لە دەست بدات، تەنیا ئامانجی جێبەجێکردنی ئەم یاسایە ئەوەیە کە زۆرینەی دزەکان بێ ئومێد بکات و، ڕێژەیەکی زۆر کەم دەمێنێتەوە کە دزی بکات؛ لە ئەنجامیشدا دەستی ژمارەیەکی کەم لە خەڵکی بەهۆی دزیکردنەوە دەبڕدرێن، بەڵام لەبەرامبەردا ملیۆنان کەس بە ئاشتی و ئارامی دەژین.

**٣- ئیسلام ڕێگە دەگرێت لە لاقەکردنی ئافرەتان و، حیجابی بۆ پیاوان و ئافرەتان پێویست کردووە و، سزای لە سێدارەدانیش بەسەر ئەو کەسانەدا دەسەپێنێت کە دەستدرێژی سێکسی دەکەنە سەر کەسێك.**

**یەکەم:** ئیسلام وەسفی چۆنیەتی لەناوبردنی ئازاردان و لاقەکردنی ئافرەتان دەکات:

هەموو ئایینە سەرەکییەکان ئاماژە بەوە دەکەن ئازاردان و لاقەکردنی ئافرەتان تاوانێکی گەورەیە، ئیسلامیش هەمان بیروڕای هەیە دەی کەواتە جیاوازی چییە لەنێوان ئاینەکانی تر و ئاینی ئیسلامدا؟ جیاوازییەکە ئەوەیە کە ئاینی ئیسلام ڕێزێکی زیاتری بۆ ئافرەت داناوە، ئازاردان و دەستدرێژیکردنە سەر ئافرەتانی بە تاوانێکی مەترسیدار داناوە و، ڕێگایەکی ڕوونیشی باسکردووە کە چۆن کۆمەڵگا خۆی بە دوور بگرێت لەو جۆرە تاوانانە.

**دووەم:** حیجاب بۆ پیاون: (لە پەڕەکانی پێشووتردا باسکراوە).

**سێیەم:** حیجاب بۆ ئافرەتان: (لە پەڕەکانی پێشووتردا باسکراوە).

**چوارەم:** حیجاب ئافرەتان لە ئازاردان دەپارێزێت: (لە پەڕەکانی پێشووتردا باسکراوە).

**پێنجەم:** نموونەی دوو خوشکە دوانەکە: (لە پەڕەکانی پێشووتردا باسکراوە).

**شەشەم:** سزای لە سێدارەدان بۆ ئەو کەسانەی کە دەستدرێژی سێکسی دەکەنە سەر ئافرەتان: (لە پەڕەکانی پێشووتردا باسکراوە).

**حەوتەم:** ئەمریکا زۆرترین ڕێـژەی دەستدرێژی کردنە سەر ئافرەتی تۆمارکردووە: (لە پەڕەکانی پێشووتردا باسکراوە).

# پرسیاری نۆزدەهەم

## جیاوازی زۆر دیار لە نێوان ئاینی ئیسلام و جێبەجێکردنی کردارییانەی موسوڵمانان

**ئەگەر ئاینی ئیسلام باشترین ئاینی سەر ڕووی زەوی بێت، بۆچی ژمارەیەکی زۆر لە موسوڵمانان ناڕاستگۆ و جێی متمانە نین و، لە فێڵکردن و بەرتیل وەرگرتن و بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەرەوە تێوەگلاون و بەشدارن؟**

## وەڵام:

### ١- ڕاگەیاندنەکان ئیسلام بە ناشیرینی نیشان دەدەن:

**یەکەم:** بەبێ هیچ گومانێك ئاینی ئیسلام باشترین ئاینە، بەڵام ڕاگەیاندنەکان دەستیان هەیە لە پشت ترساندنی خەڵکی ڕۆژئاوا بەرامبەر بە ئیسلام، ڕاگەیاندنەکان بەشێوەیەکی بەردەوام زانیاری نادروست بەرامبەر بە ئیسلام و مزگەوت و ...هتد بڵاودەکەنەوە.

**دووەم:** کاتێك لەهەر شوێنێك بۆمبێك بتەقێتەوە ئەو کەسانەی یەکسەر بەبێ بوونی هیچ بەڵگەیەك تۆمەتباردەکرێن بە ئەنجامدانی ئەو کارە موسوڵمانانن و، کتوپڕ لەسەردێڕی هەواڵەکاندا پەخشدەکرێت، دواتر

دوای ئەوەی بەڵگە و کەسەکان ئاشکرا دەبن و دەردەکەوێت کەسێکی ناموسوڵمان ئەو کارەی ئەنجامداوە ئەوا بە بێ بەها تەماشای ڕووداوەکە دەکرێت.

**سێیەم:** ئەگەر پیاوێکی موسوڵمانی تەمەن (٥٠ساڵ) کچێکی (١٥ساڵ) مارە بکات بەڕەزامەندی خۆی؛ ئەوا لە لاپەڕەی یەکەمی ڕاگەیەندنەکاندا بڵاودەکرێتەوە، بەڵام کاتێك پیاوێکی ناموسوڵمانی تەمەن (٥٠ ساڵ) دەستدرێژی سێکسی بکاتە سەر کچێکی (٦ ساڵ) لە هەواڵەکاندا زۆر بەبێ گرنگی و بێ بەها باسدەکرێت و، لە ناو کورتەی هەواڵەکانی هەموو ڕۆژێکی ئەمریکادا بڵاودەکرێتەوە، لە تێکڕای (٢٧١٣) حاڵەتی لاقەکردن کە ڕوویانداوە هیچیان نەبوونەتە جێی بایەخی دەزگاکانی ڕاگەیاندن هەرچەندە لەو جۆرە حاڵەتانە بوونەتە شێوازیکی ژیان لە ئەمریکا.

## ٢- کەسانی کەمتەرخەم لە هەموو کۆمەڵگایەکدا هەیە:

من ئاگادارم لەوەی هەندێك موسوڵمان هەن کە ناڕاستن و جێی باوەڕ نین، بەڵام ڕاگەیاندنەکان بەوشێوەیە بیردەکەنەوە کە تەنیا موسوڵمانان لەم جۆرە کارانەدا تێوەگلاون، لەکاتێکدا لەهەموو کۆمەڵگایەکدا کەسانی کەمتەرخەم هەن و، کۆمەڵگای ئیسلامیش بەدەر نییە لەو جۆرە کەسانە.

## ٣- لە ئەنجامدا موسوڵمانەکان باشترینن:

سەرباری هەبوونی هەموو ئەو جۆرە کەسانە لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا، بەڵام هێشتا باشترین کۆمەڵگای جیهان پێکدێنن، ئێمەی موسوڵمانان

گەورەترین کۆمەڵگاین کە مادده کحولییەکان بەکارناهێنین. بەتێکڕا ئێمە کۆمەڵگایەکین کە زۆرترین بەخشینمان هەیە لە جیهاندا؛ لەبەرامبەردا کەسێك یان لایەنێك نییە کە مۆمێکی ئومێد بۆ موسوڵمانان دابگیرسێنێت لەو شوێنەی کە نەهامەتی هەیە.

## ٤- لە چاوی شۆفێرەکەیەوە بڕیار لەسەر ئۆتۆمبێلەکە مەدەن:

ئەگەر دەتەوێت بڕیار لەسەر دوامۆدێلی ئۆتۆمبێلی جۆری مارسیدس بدەیت کە تا چەند باش یان خراپە، ئەوا نابێت بڕیارەکە لەسەر بنەمای چۆنیەتی بەکارهێنانی ئۆتۆمبێلەکە بێت لەلایەن ئەو شۆفێرەی کە لێیدەخورێت و، بەشێوەیەکی خراپ بەکاریدەهێنێت، بەڵکو دەبێت تەماشای توانا و لێهاتوویی و سەلامەتی و بڕی ئەو سوتەمەنیەی کە سەرفی دەکات بکرێت. لەبەر خاتری گفتوگۆکە ڕەنگە ڕازی ببم بەوەی کە بڵێم باشە شوێنکەوتووانی ئیسلام خراپن، بەڵام ناتوانین بڕیار لەسەر باشی و خراپی ئیسلام بدەین لەڕێگەی شوێنکەوتووانیەوە، ئەگەر دەتەوێت بڕیار لەسەر ئەوە بدەیت کە بڕیاری دروست لەسەر ئیسلام بدەیت، ئەوا دەبێت بگەڕێیتەوە بۆ قورئان و فەرموودەی صەحیح.

## ٥- بڕیار لەسەر ئیسلام بدە لەڕێی باشترین شوێنکەوتەیەوە ئەویش موحەمەد پێغەمبەرە (د.خ):

ئەگەر بەشێوەیەکی کرداری دەتەوێت بزانیت کە تاچەند ئۆتۆمبێلەکە باشە؛ ئەوا پێویست شوفێرێکی شارەزای لەسەر دابنرێت تاکو کوالیتی ئۆتۆمبێلەکە

بەباشی دەربخات، هاوشێوەی ئەمە گەر دەتەوێت بزانیت کە ئاینی ئیسلام تاچەند ئایینێکی دروست و باشە، ئەوا دەبێت لە ڕێگەی باشترین شوێنکەوتەیەوە هەڵیبسەنگێنیت کە ئەویش کۆتا پێغەمبەر موحەمەدە (د.خ)، هاوشانی زانایان و مێژوونووسانی ئیسلامی چەندین مێژوونووسی ناموسوڵمان کە زۆر بە ڕاستگۆیانە باسی کەسایەتی پێغەمبەریان کردووە لە کتێبێکی «مایکڵ هارت»دا بە ناوی: «سەد کاریگەرترین پیاوانی جیهان» ناوی موحەمەد پێغەمبەر (د.خ) لەسەرووی ڕیزبەندی هەموویانەوە وەکو یەکەم کەسی کاریگەر لە جیهاندا لە کتێبەدا ناوی هاتووە.

# پرسیاری بیستەم
# بە ناموسوڵمانەکان دەوترێت «کافر»:

**بۆچی موسوڵمانەکان بە «کافر» ناوی ناموسوڵمانەکان دەبەن؟**

## وەڵام:

«کافر» دەدرێتە پاڵ کەسێك کە شتەکان ڕەت بکاتەوە، «کافر» وشەیەکی عەرەبییە و، لە وشەی «کفر»ەوە وەرگیراوە کە بەمانای کەسێك ڕاستی دەشارێتەوە، یان ڕەتی دەکاتەوە.

ئەگەر ناموسوڵمانەکان پێیان ناخۆشە پێیان بوترێ «کافر» و، بە سووکایەتی و گاڵتەپێکردن وەریدەگرن، ئەوا پێویستە ئاینی ئیسلام قبوڵ بکەن.

# بیست و یەکەم

## ئەم قورئانەی کە ئێستا لەبەردەست موسوڵماناندایە چاپە سەرەکی و بنچینەییەکە نییە

**زۆر چاپی قورئان هەبوون کە سووتێنراون لەلایەن حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لەسەر بێت) تەنها یەک دانە نەبێت، ئەو قورئانەی ئێستا لەبەردەستدایە ئەو قورئانەیە کە لەلایەن عوسمانەوە کۆکراوەتەوە و، ئەوەش چاپە بنچینەییەکەی قورئان نییە؟**

## وەڵام/

یەکێك لە ئەفسانە زۆر باوەکان سەبارەت بە قورئان ئەوەیە کە عوسمان سێیەم خەلیفەی موسوڵمانان یەك قورئانی کۆکردووەتەوە لە چەند کۆپییەك کە لەو کاتەدا هەبوون، قورئان لەلایەن هەموو موسوڵمانانی دونیاوە بە قسەی خوا دەزانرێت و هەژمار دەکرێت، ئەوە هەمان ئەو قورئانەیە کە بە سروش بۆ محەمەدی پێغەمبەر (د.خ) ٩٧٨٠٠٠٠٣٠٠٠٠٣کە قورئانێکی ڕاستەقینەیە لە ژێر چاودێری پێغەمبەردا نووسراوەتەوە، ئێمە ئێستا ڕیشەی ئەو ئەفسانەیە هەڵدەسەنگێنین کە عوسمان قورئانی ڕاستەقینەی هەیە.

## ١- پێغەمبەر (د.خ) خۆی سەرپەرشتی نووسینەوەی قورئانی کردووە:

هەرکاتێك کە پێغەمبەر (د.خ) لەڕێگەی سروشەوە قورئانی پێگەیشتووە، ئەوا سەرەتا خۆی دەقی ئەو قورئانەی لەبەر دەکرد کە بۆی دابەزیوە، دواتر هاوەڵەکانی لە سروشەکە ئاگادار دەکردەوە و بۆی دەگێڕانەوە، تاکو ئەوانیش لەبەری بکەن، پێغەمبەر یەکسەر داوای لە نووسەرەکانی قورئان دەکردەوە کە ئەو ئایەتە بنووسنەوە کە بە سروش لەلایەن خواوە بۆی دابەزیوە، دواتر خۆی تەماشای دەکردەوە، پێغەمبەر (د.خ) کەسێکی نەخوێندەوار بوو کە نەیدەتوانی بنووسێت و بخوێنێتەوە، کەواتە دوای پێگەیشتنی هەر ئایەتێك بۆ هاوەڵەکانی دووبارەی دەکردەوە و ئەوانیش دەیاننووسییەوە، دواتر خودی خۆی داوای لێدەکردن کە ئەوەی نووسیویانە جارێکی تر بۆی بخوێننەوە، ئەگەر هەر هەڵەیەك هەبووایە ئەوا چاکی دەکردەوە، تەنانەت بە هاوەڵەکانیشیدا چاوێکی بەو دەقە نوسراوەنەدا دەخشاندەوە کە دەقی قورئانەکەیان لەبەرکردبوو، بەم ڕێگایە لە ژێر چاودێری تایبەتی خۆیدا تەواوی قورئان نووسراوەتەوە.

## ٢- قورئان بە دوای یەکدا هاتووە لە ڕێـی سروشتی ئاسمانییەوە:

تـەواوی قورئان لە ماوەی (٢٢ ساڵ و نیو) بەش بەش لەو کاتەی کە پێویست بووە دابەزیوەتە خوارەوە، قورئان لە لایەن پێغەمبەرەوە (د.خ) بە شێوەیەکی یەك لە دوای یەك و بەپێی پێویست کۆنەکرایەوە، قورئان لە ڕێی سروشتی ئاسمانییەوە بە دوای یەکدا بۆ پێغەمبەر (د.خ) لە ڕێگەی

«جبرائیل»ەوە هاتۆتە خوارێ، هەر کاتێك ئەو سرووشانە دەگوازرایەوە بۆ هاوەڵەکانی؛ پێغەمبەر (د.خ) ئاماژەی بۆ ئەوە دەکرد کە لە چ سوورەتێك و دوای چ ئایەتێك دابنرێت.

هەموو مانگی ڕەمەزانێك هەموو بەشەکانی قورئان کۆدەکرایەوە، لەگەڵ ئەو ئایەتەشدا کە پێشتر دابەزیبوون، لە ماوەی کۆتا مانگی ڕەمەزاندا پێش ئەوەی پێغەمبەر (د.خ) کۆچی دوایی بکات، جارێکی تر قورئان پشکێنراوەتەوە و دووجار پێداچوونەوەی بۆ کراوە، ئەمە بەڵگەیەکی ڕوونە کە قورئان لەلایەن پێغەمبەرەوە (د.خ) کۆکراوەتەوە لە ماوەی ژیانی خۆیدا بە هەر دوو شێوەی نوسراو و لەبەرکراو لەلایەن چەندین هاوەڵی پێغەمبەرەوە (د.خ).

### ٣- قورئان لەسەر یەك مادەی باو نوسراوەتەوە:

تەواوی قورئان لەگەڵ ڕیزبەندی تەواو و دروستی ئایەتەکان لەسەردەمی ژیانی پێغەمبەردا ڕێکخراون، هەرچەندە ئایەتەکان لەسەر پارچە پێست و بەردی تەخت و تەنك و نامیلکەو لقی دارخورما ...هتد نوسراونەتەوە، دوای وەفاتی پێغەمبەر (د.خ)، ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لەسەر بێت) یەکەم خەلیفەی موسوڵمانان، فەرمانی کرد بەوەی کە ئەو چەند جۆرە مادده جیاوازەی کە قورئانی لەسەر نوسراوەتەوە بخرێتە سەر یەك جۆرە مادده و، لەیەك شوێندا دابنرێت کە لە شێوەی پارچە کاغەزدا بێت و، ئەو پارچە کاغەزانەش دەبێت بە دەزوو یان شتێك توووند ببەسترێت؛ تا ڕێگە بگرێت لە ون بوون و هیچ بەشێکی قورئانەکە نەفەوتێت.

٤- عوسمان (ڕەزای خوای لەسەر بێت) چەند کۆپییەکی قورئانی دروستکرد بە دەستنووسە سەرەکییەکەوە.

چەندین هاوەڵی پێغەمبەر ڕاهاتبوون لەسەر نووسینەوەی قورئان بە شێوازی خۆیان لەو کاتەی کە گوێبیستی دەبوون لەسەر لێوی پێغەمبەرەوە (د.خ)، هەرچەندە ئـەوەی ئـەوان دەیاننووسیەوە لەلایەن خودی پێغەمبەرەوە (د.خ) هەڵسەنگاندنی بۆ نەدەکرا، بۆیە دەکرا چەندین هەڵەی تێدا بووبێت، هەموو ئایەتەکان کە بۆ پێغەمبەر (د.خ) دابەزیون، ڕەنگە لەلایەن هەموو هاوەڵەکانیەوە نەبیسترابێت، یاخود هەندێك لە هاوەڵەکانی ئامادەی ئەو دانیشتنە نەبووە کە پێغەمبەر ئایەتەکەی بۆ گێڕاونەتەوە لە ئەنجامدا چەند بەشێکی جیاواز لەلایەن چەند هاوەڵێکەوە نەنوسراونەتەوە، ئەمەش بووە هۆکاری دروستبوونی ململانێ لە نێوان موسوڵمانان لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی خەلیفەی سێیەم «عوسمان»دا.

عوسمان دەستنووسە سەرەکییەکەی قورئانی هێنا کە لەلایەن «حەفصە»وە هەڵگیرابوو کە هاوسەری پێغەمبەر (د.خ) بوو، عوسمان فەرمانی بە چوار هاوەڵ کرد کە لەنێوان ئەو کەسانەدا بوون کە قورئانیان نووسیبووەوە صلى الله عليه وسلم ئەو کاتەی کە پێغەمبەر (د.خ) گێڕابوویەوە، ئەو چوار هاوەڵە لەلایەن «زیاد بن پابت»ەوە سەرکردایەتی دەکـران بۆ نووسینەوەی دەقی قورئان لە چەند کۆپییەکی تەواودا، دواتر کۆپییەکان لەلایەن عوسمانەوە نێردران بۆ سەنتەری موسوڵمانان، لە هەمان کاتدا چەند کۆکراوەیەکی چەند بەشێکی قورئان هەبوو لەلای خەڵکی کە ناتەواوبوون و هەڵەیان تێدابوو، خەلیفەی موسوڵمانان داوای لێکردن کە

هەموو ئەو کۆپییە ناتەواو و پڕ هەڵانە لەناو بەن کە یەك ناگرێتەوە لەگەڵ دەستنووسە سەرەکییەکەدا؛ بۆ ئەوەی دەقی قورئانە سەرەکی و بنچینەییەکە بپارێزین، دوو لەو کۆپییانە کە لە دەقە سەرەکییەکەوە کۆپی کراون تا ئێستاش ماون، یەکێکیان لە ڕووسیایە و و ئەوی تریشیان لە مۆزەخانەی «تۆپ قاپی»ە لە تورکیا.

## ٥- هێماکانی جەختکردنەوە لەلایەن غەیرە عەرەبەکانەوە زیادکراوە.

دەستنووسی سەرەکی قورئان ئەو هێمایانەی نییە کە ئاماژە دەکەن بۆ دەنگی نەبزوێن لە نووسینی عەرەبیدا. ئەو دەنگە نەبزوێنانە بە (ئەتتەشکیل، زەبەر، پەیشن، ئۆردۆ، ئەسفەتەح، دامە و قاسرەین) ناسراون، عەرەبەکان داوای هێماکانی دەنگی بزوێن و هێماکانی جەختکردنەوە ناکات بۆ دەستکەوتنی شێوازی خوێندەنەوەیەکی دروستی قورئان، هەرچەندە کە زمانی عەرەبی زمانی دایکیانە، بۆ موسوڵمانە غەیرە عەرەبەکان کە قورس بووە، تاکو قورئان بە دروستی بخوێننەوە بە بێ دەنگی نەبزوێن؛ ئەو هێمایانە ناسێنراون و زیادکران بۆ دەقی قورئان لە ماوەی کاتی پێنجەم خەلیفەی موسوڵمانان «مەلیکی کوڕی مەروان» (٦٦-٨٦ی هیجری /٦٨٥-٧٠٥ زایینی) و، لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەلحەجاج لە عێراقدا.

هەندێك خەڵك مناقەشەی ئەوە دەکەن کە ئەو قورئانەی کە ئێستا لەبەردەستدایە بە دەنگی بزوێن و هێماکانی جەختکردنەوە بە هەمان ئەو قورئانە نییە کە لە سەردەمی پێغەمبەردا (د.خ) لەبەر دەستابووە، بەڵام ئەوان شکستیان هێنا بەوەی درك بەوە بکەن کە وشەی «قورئان» بەمانای

«خوێندنەوە» دێت، لەبەرئەوە پاراستنی خوێندنەوەی قورئان گرنگە بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی گەر نووسینەکە جیاواز بێت یان گەر دەنگی بزوێنی تێدا بێت، ئەگەر شێوازی خوێندنەوەکە و عەرەبییەکە هەمان شت بێت ئەوا ماناکەشی وەك خۆی دەمێنێتەوە.

## ٦- خوا خۆی بەڵێنی داوە پارێزگاری لە قورئان بکات:

خوای گەورە لە قورئاندا بەڵێنی داوە: {إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ} (الحجر: ٩)، واتە: (بەڕاستی خۆمان ئەم قورئانەمان ناردۆتە خوارێ و هەر خۆشمان ئاگادار و پارێزگاری دەبین).

# پرسیاری بیست و دووەم
# ئایا ئیسلام توندوتیژی بەرهەم دەهێنێت؟

**ئایا ئیسلام ڕێگە بە توندوتیژی و خوێنڕشتن و دڕندەیی دەدات لە کاتێکدا لە قورئاندا هاتووە کە موسوڵمانان پێویستە کافرەکان بکوژن لەهەر شوێنێک بینییان؟**

## وەڵام/

چەند ئایەتێکی کەم لە قورئاندا هەڵە لێکدراونەتەوە بۆ وا نیشاندانی ئەوەی کە ئیسلام ڕێگە بە توندوتیژی دەدات و شوێنکەوتووانی هان دەدات ئەوانە بکوژن کەلە دەرەوەی بازنەی ئیسلامدان.

### ١- ئایەتێك لە سوورەتی التوبە:

ئەم ئایەتەی خوارەوە لە سوورەتی التوبە زۆرجار لە لایەن ڕەخنەگرانی ئیسلامەوە بە هەڵە لێکدراونەتەوە بۆ دەرخستنی ئەوەی کە ئیسلام ڕێگە دەدات بە توندوتیژی و خوێنڕشتن و دڕندەیی: {فَإِذَا انْسَلَخَ الْأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ} (التوبة: ٥)، واتە (ئینجا کە مانگە حەرام و خاوەن ڕێزەکان بڕانەوە، واتە ئەو مانگانەی کە جەنگیان تێدا قەدەغەکراوە «زیلقەعیدە، زیلحیجە، موحەڕەم، ڕەجەب»، لە هەر جێگەیەکدا موشریکەکانتان دەستکەوت

بەمەرجێ (ژن و منداڵ و گۆشەگیر نەبن) بیانکوژن و بیانگرن و گەمارۆیان بدەن و لە هەموو کەمین و ڕێگەیەکیشدا بۆیان دانیشن، ئەگەر پەشیمان بوونەوە لە هاوبەش دانان بۆ خوا و بەڕێك و پێکی نوێژیان ئەنجامدا، زەکاتیان جێبەجێکرد، ئێوەش ڕێگەیان بۆ چۆڵ بکەن بەڕاستی لە خودا زۆر لێبوردەیە و زۆریش دلۆڤان و میهرەبانە بەرامبەر بە تەوەبەکاران).

## ٢- ناوەڕۆکی ئەم ئایەتە لەماوەی جەنگدایە:

ڕەخنەگرانی ئایینی ئیسلام ئەم ئایەتە باس دەکەن بە بێ باسکردنی ناوەڕۆکەکەی، بۆ ئەوەی لە ناوەڕۆکەکەی تێبگەیت ئەوا پێویستە کە لە ئایەتی «یەکی» ئەو سوورەتەوە بخوێنرێتەوە، دەفەرموێت: کە پەیمانێکی ئاشتی هەبوو لە نێوان موسوڵمانان و بت پەرستەکانی مەککەدا، ئەم پەیمان نامەیە لەلایەن بت پەرستەکانەوە پێشێل کرا، لە بەرامبەردا ماوەی چوار مانگ دەرفەت درا بە بت پەرستەکانی مەککە، تاکو پەیمانەکە چاك بکەنەوە و پەیڕەوی بکەن ئەگەر نا شەڕ ڕادەگەیەنرێتێ لە دژیان.

## ٣- نموونەی جەنگی نێوان ئەمریکا و ڤێتنام:

ئێمە دەزانین کە ئەمەریکا لە پێشدا لە جەنگدا بووە لەگەڵ ڤێتنام، وا دابنێ سەرۆکی ئەمەریکا، یان جەنەڕاڵی سوپای ئەمەریکا بە سەربازە ئەمەریکییەکانی وتووە لە ماوەی شەڕدا «لە هەر شوێنێك ڤێتنامییەکتان دۆزیەوە بیکوژن» ئەمڕۆ ئەگەر من بڵێم کە سەرۆکی ئەمەریکا وتویەتی: «لەهەر شوێنێك ڤێتنامیتان بینی بیکوژن» بە بێ ئەوەی ئەو بارودۆخە ڕوون بکەمەوە کە ئەم قسەیەی تێداکراوە؛ ئەوا وەکو قەسابخانەیەك دێتە

بەرچاو، بەڵام ئەگەر من باسی ناوەڕۆکەکەی بکەم کە ئەو قسەیە لە کاتی شەڕدا کراوە؛ ئەوا زۆر لۆژیکی دەردەکەوێت بەوەی کە ویستوویەتی ورەی سەربازە ئەمەریکییەکان بەرز بکاتەوە لە کاتی شەڕەکەدا.

## ٤- ئایەتی «پێنج» لە سوورەتی (التوبە) بۆ بەرزکردنەوەی ورەی موسوڵمانەکان بووە لە کاتی شەڕدا:

هاوشێوەی نموونەکەی پێشوو ئەوەی کە لە سوورەتی **(التوبة)** ئایەتی (٥)دا ئاماژەی پێکراوە بۆ بەرزکردنەوەی ورەی موسوڵمانەکان بووە لە کاتی شەڕدا، بۆ ئەوەی نەترسن پێیان وتراوە لەهەر کوێ دوژمنتان بینی بیانکوژن.

## ٥-شۆری لە ئایەتی (٥) بۆ ئایەتی (٧)ی سوورەتی (التوبة) بازی داوە.

ئارون شۆری یەکێکە لە ڕەخنەگرە بەهێزەکان کە ڕەخنە لە ئیسلام دەگرێت لە وڵاتی هیندستان، ئەو ئاماژە بە هەمان ئایەتی سوورەتی دەکات لە کتێبەکەیدا بە ناوی: «جیهانی فەتواکان» لە لاپەڕەی (٥٧٢) پاش باسکردنی ئایەتی (٥) بازیداوە بۆ ئایەتی (٧)ی سوورەتی (التوبة)، هەموو کەسێك هەست بەوە دەکات کە ئایەتی (٦)ی پەڕاندووە.

## ٦- سوورەتی (التوبە) ئایەتی (٦) وەڵام دەداتەوە:

سوورەتی (التوبة) ئایەتی (٦) وەڵامی ئەوانە دەداتەوە کە ئایا ئیسلام ڕێگە بە توندوتیژی و خوێنڕشتن و توندڕەوی دەدات؟ دەفەرموێت: {وَإِنْ أَحَدٌ

مِنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَعْلَمُونَ} (التوبة: ٦)، واته: (ئەگەر یەکێك لەو موشریکانە پەنای پێهێنایت پەنای بدە، تا بە باشی فەرمایشتی خوا دەبیستێ و لێی حاڵی دەبێت، پاشان بیگەیەنە بە شوێنێك کە هێمن و ئاسوودەبێت و لە هیچ نەترسێ، چونکە ئەوانە گەلێکن نازانن ئیمان و بڕوا چییە).

قورئان بە تەنها نافەرموێت کە بت پەرستەکان بە دوای پەنابەری دەگەڕێن لە ماوەی شەڕدا کە دەبێت مافی پەنابەرییان پێ ببەخشرێت؛ بەڵکو دەبێت بشگەیەنرێنە شوێنێکی سەلامەت، لە ئیستادا جەنەڕاڵێکی میهرەبان و ئاشتیخواز لەمیانی شەڕدا ڕەنگە ڕێگە بە سەربازانی دوژمن بدات ئازاد بن ئەگەر ئەوان ئاشتییان بوێت، بەڵام چ جەنەڕاڵێکی سوپا بە سەربازەکانی دەڵێت کە ئەگەر سەربازانی دوژمن بە دوای ئاشتیدا گەڕان لە کاتی شەڕدا بهێڵن ئازادبن؟ ئەمە تەواو ئەوەیە کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێ دەکات؛ ئەویش ڕێگەدانە بە ئاشتی لە جیهاندا.

# پرسیاری بیست و سێیەم

## قورئان وشەی «ئێمە» بەکاردەهێنێت بۆ خوا

**ئایا ئیسلام بڕوای بە چەند خواوەندێک هەیە؟ چونکە قورئان وشەی «ئێمە» بە کاردەهێنێت کاتێ خوا لە قورئاندا قسە دەکات؟**

## وەڵام/

ئیسلام بەشێوەیەکی بنەڕەتی ئایینێکە کە بڕوای بە بوونی یەك خودا هەیە، پەیوەستە بە یەك خوداوە، بڕوای وایە کە خوا تەنها و تاکە، لە قورئاندا خوای گەورە زۆرجار ئاماژە بۆ خۆی دەکات لە ڕێگەی بەکارهێنانی «ئێمە»، بەڵام ئەمە بە مانای ئەوە نایەت کە ئیسلام بڕوای بە بوونی زیاتر لە خوایەك هەبێت.

### دوو جۆر وشەی «کۆ» هەیە:

لە چەندین زماندا دوو جۆر «کۆ» بوونی هەیە، یەکێکیان «کۆ» لە ژمارەدا کە ئاماژەیە بۆ شتێك کە لەیەك شت زیاتر بێت، «کۆ» یەکەی تر «کۆ»ی ڕێزە.

١- لە زمانی ئینگلیزیدا، شاژنی ئینگلتەرا ئاماژە بۆ خۆی دەکات بە «ئێمە» لە جیاتی بەکارهێنانی «من» ئەمە بە کۆی شایانە ناسراوە.

٢- گاندی سـەرۆك وەزیـرانـی هیندستان وا ڕاهاتبوو بڵێت: «ئێمە دەمانەوێت»، «ئێمە» هێمایەکە لە «کۆی شایانە».

٣- هاوشێوەی ئەمانە لە زمانی عەرەبیدا، کاتێك خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بۆ خۆی دەکات، زۆرجار وشەی «نحن» بەکاردێت کە بە مانای «ئێمە» دێت، ئەوە بە مانای «کۆ» نایەت لە ژمارەدا، بەڵکو بە مانای «کۆ»ی ڕێز دێت. یەکتاپەرستی و بڕوابوون بە بوونی یەك خوا یەکێکە لە کۆڵەکەکانی ئیسلام، هەبوون و تەنهایی خوا چەندین جار لە قورئاندا ئاماژەی پێکراوە: {قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ} (الاخلاص: ١). واتە (ئەی موحەمەد بڵێ ئەو پەروەردگارەی من دەیپەرستم تاك و تەنیایە و هاوەڵ و هاوبەشی نییە).

# پرسیاری بیست و چوارەم
## بیرۆکەی هەڵوەشاندنەوە

**موسوڵمانان بڕوایان بە بیرۆکەی هەڵوەشاندنەوە هەیە، بە مانایەکی تر بڕوایان بەوەیە کە ئایەتە پێشووترەکانی قورئان ئاڵوگۆڕکراون بە ئایەتی تر کە دواتر دابەزیون، ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە خوا هەڵەی کردووە و دواتر چاکی کردووەتەوە؟**

## وەڵام/

### ١- دوو لێکدانەوەی جیاواز:

قورئانی پیرۆز لەم چەند ئایەتەی خوارەوەدا دەفەرموێت: {مَا نَنْسَخْ مِنْ آَيَةٍ أَوْ نُنْسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِنْهَا أَوْ مِثْلِهَا أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ} (البقرة: ١٠٦)، واتە: (ئێمە لە قورئاندا هەر ئایەتێك بسڕینەوە و لەکاری بخەین یان فەرامۆشی بکەین و لەبیری ببەینەوە، لە جیاتی ئەوە ئایەتێکی چاکتر و ئاسانتر هەر وەکو ئەوە دەخەینە جێی تا لە پاشەڕۆژدا ببێتە مایەی پاداشتی گەورەتر و زیاتر).

وەکو سەرچاوەیەك بۆ ئەمە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: {وَإِذَا بَدَّلْنَا آَيَةً مَكَانَ آَيَةٍ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوا إِنَّمَا أَنْتَ مُفْتَرٍ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ} (النحل: ١٠١)، واتە: (هەرکاتێك ئێمە ئایەتێك بە ئایەتێکی تر بگۆڕین و لابەرین وە یان ئایەتێکی تر لە جێی ئەو دابنێین، خوا بۆ خۆی

زاناترە بەوەی دایدەبەزێنێ لەوەڵامدا دەیانوت تۆ هەر درۆ هەڵدەبەستی، بەڵکو ئەوان زۆربەیان خۆیان نەزانن و لە حیکمەتی خوا تێناگەن).
لەم ئایەتدا وشەی عەرەبی «ئایات» بە مانای «هێما»، یان «ئایەت» و هەروەها بە مانای»سروش» دێت، ئەم ئایەتەی قورئانە دەتوانرێت بە دوو شێواز لێکبدرێتەوە:

**شێوازی یەکەم:** ئەو سروشانەی کە هەڵوەشێنراوەتەوە یان ئاڵوگۆڕیان پێکراوە؛ ئەو سروشانەن کە پێش قورئان بوون بۆ نموونە: «تەورات، زەبور، ئینجیل». لێرەدا خوا دەفەرموێت کە ئەو نەبووەتە هۆکار بۆ ئەوەی سروشەکانی پێشووتر لەبیر بکرێن، بەڵام ئەو ئاڵوگۆڕی پێکردوون بە شتێکی باشتر و هاوشێوە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئینجیل و تەورات و زەبور ئاڵوگۆڕکراون بە قورئان.

**شێوازی دووەم:** ئەگەر وا دابنێین کە وشەی عەرەبی «ئایەت» لەو ئایەتەی سەرەوە ئاماژە بێت بۆ ئایەتەکانی قورئان، نەك سروشەکانی پێشووتر، کەواتە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هیچ کام لە ئایەتەکانی قورئان هەڵنەوەشاوەتەوە، بەڵکو بە شتێکی باشتر و هاوشێوە شوێنی گیراوەتەوە، ئەمە بە مانای ئەوە دێت کە چەند ئایەتێکی دیاریکراو لە قورئان کە پێشتر دابەزیون شوێنیان بەو ئایەتانە گیراوەتەوە کە دواتر دابەزیون، من لەگەڵ هەردوو لێکدانەوەکەدا هاوڕام زۆر لە موسوڵمانەکان و ناموسوڵمانەکان بە هەڵە لە لێکدانەوەی دووەم گەیشتوون؛ بەوەی کە بەمانای ئەوە دێت لە ئایەتە پێشووترەکانی قورئان هەڵوەشێنراونەتەوە و چیتر بۆ ئەمڕۆ ڕاست

نین، وەك ئەوەی كە ئەوان گۆڕیویانن بە ئایەتەكانی دواتری قورئان، یان ئایەتە هەڵوەشاوەكان، ئەم گرووپەی خەڵك تەنانەت بە هەڵە بڕوایان وایە كە ئەو ئایەتانە دژ بەیەك و بەرپەرچی یەك دەدەنەوە.

## ٢- بەرهەمهێنانی كتێبێك هاوشێوەی قورئان:

هەندێك لە عەرەبە بت پەرستەكان دەڵێن كە قورئان لەلایەن پێغەمبەرەوە شێوێنراوە، خوا لەم چەند ئایەتەی خـوارەوە بەرەنگاری عەرەبانەكان دەبێتەوە لە سوورەتی (الإسراء): {قُلْ لَئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنْسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا} (الإسراء: ٨٨)، واتە: (بڵێ ئەگەر هەموو مرۆڤ و جنیەكان كۆببنەوە بۆ ئەوەی وێنەی ئەم قورئانە بهێنن هەرگیز ناتوانن وێنەی ئەو بهێنن ئەگەر هەندێكیان پاڵپشت و هاوكاری هەندێكیان بن بۆ ئەنجامدانی ئەو كار).

دواتر ئەو بەرەنگاربوونەوەیە سادەتر بوو لەم ئایەتەی سوورەتی (هود): {أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُوا بِعَشْرِ سُوَرٍ مِثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ} (هود: ١٣)، واتە: (یان دەڵێن موحەمەد خۆی ئەم قورئانەی هەڵبەستووە و داویەتە پاڵ خوا، پێیان بڵێ جا ئەگەر ئێوە ئەو قورئانە بە درۆ و هەڵبەستراو دەزانن، فەرموون ئێوەش دە سوورەت هەڵبەستن یان وەكو ئەوە بهێنن كە لە هەموو ڕوویەكەوە وەكو ئەو وابن، هەركەسێك دەتوانن «بێ لە خوا» بانگی بكەن بۆ هاوكاریتان ئەگەر ڕاست ئەكەن دەڵێن ئەم قورئانە درۆ و هەڵبەستراوە).

دواتر زیاتر سادەتر بوو لەم ئایەتەی سوورەتی (یونس): {أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ

قُلْ فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِثْلِهِ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ} (یونس: ٣٨)، واته (یان دەڵێن موحەمەد خۆی هەڵیبەستووە لەسەر خوا، تۆش پێیان بڵێ ئەگەر وایە تەنها سوورەتێك وەك ئەو بهێنن كە لە هەموو ڕوویەكەوە لەو بچێت، بێجگە لە خوا هەركەسێك دەتوانن هاواری بۆ بەرن و داوای یارمەتی لێبكەن بۆ ئەو كارە ئەگەر ڕاست ئەكەن).

لە كۆتاییدا لە سوورەتی (البقرة)دا زۆر بەرەنگاربوونەی عەرەبەكانی ڕوونتركردووەتەوە: {وَإِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ (٢٣) فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا وَلَنْ تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ} (البقرة: ٢٣-٢٤)، واته: (ئەگەر سەبارەت بەو قورئانەی ئێمە ناردومانەتە سەر بەندەی خۆمان ئێوە دوو دڵ و بە گومانن ئاخۆ ڕاستە یان نا؟ هەوڵ بدەن هیچ نەبێ بچوكترین سوورەت وەكو ئەو بهێنن بۆ ئەوەش شایەت و هاوباوەڕەكانتان بانگ بكەن ئەگەر ئێوە ڕاست دەكەن، وە ئەگەر هیچتان بۆ نەكرا كە هەرگیز هیچیشتان بۆ ناكرێ وەرن باوەڕ بهێنن خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی كە سووتێنەر و هەڵگیرسێنەرەكەی جەستەی ئادەمی و بەردە، كە ئێستا بۆ كافران و بێباوەڕان ئامادەكراوە).

خوای گەورە بەرەنگاربوونەی عەرەبەكانی پلە بە پلە سادەتر كردووە و، بە دابەزینی ئەو ئایەتانە سەرەتا بەرەنگاری بت پەرستەكان بووەوە بەبەرهەم هێنانی كتێبێك هاوشێوەی قورئان، دواتر یەك سوورەت لە كۆتاییدا بەرەنگاریان دەبنەوە بۆ بەرهەمهێنانی یەك سوورەت بە جۆرێك لە جۆرەكان هاوشێوەی ئایەتەكانی قورئان بێت، ئەمە بە مانای ئەوە نایەت

کە ئەو ئایەتانەی دواتر دابەزیون هەڵوەشێنراونەتەوە، بە مانایەکی تر لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٣ و٢٤) بەرپەرچی سێ ئایەتەکەی پێشووتر دەدەنەوە، بەرپەرچدانەوە بەمانای ئەوە دێت کە دوو شت ناتوانێت لەهەمان کاتدا گونجاو بێت، یان ناتوانرێت لەیەك شوێن پێکەوە دابنرێن، ئایەتەکانی پێشووتری قورئان هێشتا قسەی خوایە وە زانیارییەکانی تا ڕۆژگاری ئەمڕۆش ڕاستین، بۆ نموونە ئەو بەرەنگاربوونەوە بۆ بەرهەمهێنانی هاوشێوەی قورئان بۆ ئەمڕۆش دەبێت، هاوشێوەی بەرەنگاری بۆ بەرهەمهێنانی دە سوورەت، یەك سوورەتی هاوشێوەی قورئان ڕاست دەبێت و، توانای بەرەنگاری بۆ بەرهەمهێنانی یەك سوورەت بە جۆرێك لە جۆرەکانی هاوشێوەی قورئان، ئەمە بەرپەچدانەوەی بەرەنگاربوونەوەکانی پێشووتر نییە، بەڵام سادەترین بەرەنگاربوونەوە چووەتە ناو قورئانەوە.

وادابنێ من قسە لەسەر کەسێکی لاڵ دەکەم کە ناتوانێت قۆناغی (١٠)ی خوێندنگا ببڕێت، دواتر دەڵێم کە ناتوانێت قۆناغی (٥)ی خوێندنگا ببڕێت، دواتر دەڵێم کە تەنانەت ناتوانێت قۆناغی (یەك)یش ببڕێت، لە کۆتاییدا ئەو ناتوانێت تەنانەت قۆناغی باخچەی ساوایانیش ببڕێت، ئەوەی کە من سەبارەت بەو کەسە دەیڵێم ئەوەیە کە ئەو تەنانەت ناتوانیتَ قۆناغی باخچەی ساوایانیش ببڕێت تاکو لە خوێندنگا قبوڵ بکرێت، هەر چوار ڕستەکەم دژی یەك نابێتەوە، بەڵام دوا قسەم کە دەیڵێم ناتوانێت قۆناغی باخچەی ساوایانیش ببڕێت ئەوە بەسە بۆ دەرخستنی ئاستی زیرەکی ئەو کەسە، ئەگەر کەسێك نەتوانێت قۆناغی باخچەی ساوایان ببڕێت ئەوا بێ گومان ناتوانێت قۆناغی (١ و ٥ و١٠)ی خوێندنگاش ببڕێت، چونکە هەرگیز لە خوێندنگا وەرناگیرێت.

## ٣- حەرامکردنی خواردنەوەی مەی قۆناغ بە قۆناغ:

نموونەیەکی تر لەو ئایەتانە پەیوەندی هەیە بە حەرامکردنی خواردنەوەی مەی قۆناغ بە قۆناغ، یەکەم ئایەتی قورئان سەبارەت بە سەرخۆش بوون لە سوورەتی (البقره): {يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ نَفْعِهِمَا وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنْفِقُونَ قُلِ الْعَفْوَ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ} (البقرة: ٢١٩) ،واته: (سەبارەت بە بادە و شەراب و قومارەوە لێت دەپرسن ئاخۆ ئەوانە حەڵاڵ و ڕەوان یان حەرام و ناڕەوان؟ پێیان بڵێ تاوان و گوناهیان گەورەیە بۆ خەڵکیش بڕێك قازانج و کەڵکیان هەیە «خۆشی و لەزەتی تێدایە، باری ئابوری بۆ هەندێ کەس دەستدەدا»، بەڵام تاوان و زیانەکانی لە سوود و بەهرەکانی زیاترە، لێت دەپرسن چی ئینفاق بکەن لە ڕێگەی خوادا؟ پێیان بڵێ ئەی پەیامبەر زێدە لە خۆتان و ماڵ و منداڵتان ببەخشن هەر بەو شێوەیە خوای گەورە بەڵگەو نیشانەکانی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە بەڵکو بتوانن لە ئاکامی کاروباری دونیا و قیامەتان بیربکەنەوە).

ئایەتی دواتر سەبارەت بە هەمان بابەت لە سوورەتی (النساء) خوای گەورە دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْرَبُوا الصَّلَاةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّى تَغْتَسِلُوا وَإِنْ كُنْتُمْ مَرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنَ الْغَائِطِ أَوْ لَامَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا} (النساء ٤٣)، واتە (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە لەکاتێکدا سەرخۆشن نزیکی نوێژ مەکەونەوە هەتا بزانن چی دەڵێن، وە لە کاتی

لەش گرانیدا تا خۆتان نەشۆن نزیکی مزگەوت مەبنەوە مەگەر ڕێبواربن و لەسەفەردا بن، خۆ ئەگەر نەخۆش بوون یان لەسەفەردا بن یان یەکێکتان لەسەر پێش ئاو هاتەوە یان توخنی ژنەکانتان کەوتن و هیچ ئاوێکتان دەست نەکەوت بۆ دەست نوێژ یان خۆشتن ئەوا گڵێکی پاك پەیدا بکەن و بە دەم و چاو و دەستەکانتاندا بیهێنن بەڕاستی خوا زۆر لێبوردەیە).

دوا ئایەتی قورئانیش لەهەمبەر سەرخۆش بوون خواردنەوەی مەی لە سوورەتی (المائدة): {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ} (المائدة: ٩٠)، واتە (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بێگومان بن لەوەی کە ئارەقخۆریی و قومار و کاغەزی یانصیب و ئەو بەردەی کە حەیوانی بت پەرستەکانی لەسەر سەردەبڕدرێ بۆ زانینی بەختی باش و خراپ، ئەمانە گشت پیسن و لە کاری شەیتانن ئێوە خۆتانی لێی بەدووربگرن تاکو لە دونیا و قیامەتدا بەختەوەربن).

قورئان لە ماوەی (٢٢ ساڵ و نیو)دا نوسرایەوە، زۆر چاکسازی لە کۆمەڵگادا کرا بە شێوەی قۆناغ بە قۆناغ بوو، ئەمەش بۆ ئاسانکردنی گرتنەخۆی یاسای نوێ لەلایەن خەڵکەوە، چونکە گۆڕانکاری لە ناکاو و کتوپڕ هەمیشە سەردەکێشێت بۆ یاخیبوونی خەڵك و گێرەشێوێنی.

قەدەغەکرن و حەرامکردنی خواردنەوە بە سێ قۆناغ کرا، لە ئایەتی یەکەمدا تەنها ئاماژە بۆ ئەوە کرابوو کە خواردنەوە تاوانێکی گەورەیە

و هەندێك سوودی هەیە بەڵام گوناحەکەی گەورەترە لە سوودەکانی، لە دووەم ئایەتدا ئاماژە بەوە کرا کە کەسێك نابێت لە ڕۆژدا بخواتەوە، چونکە موسوڵمان پێویستە لە ڕۆژێکدا پێنج جار نوێژ بکات، لەم ئایەتەدا باس لە خواردنەوە ناکات لە شەودا، لەبەرئەوەی کە هیچ نوێژێك نییە لە شەودا بۆیە ڕێگەدراوە کە لە شەودا بخواتەوە بە مانای ئەوەی کە کەسێك دەتوانێت بخواتەوە و دەشتوانێت نەخواتەوە.

ئەگەر ئەم ئایەتە ئاماژەی بەوە بکردایە کە کەسێك کە خواردویەتییەوە ناتوانێت نوێژ بکات؛ ئەو کات بەرپەچ دانەوە دەبوو، خوا وشەکان لە شوێنی خۆیدا بەکاردەهێنێت لە کۆتاییدا تەواو حەرامکردنی خواردنەوەی مەی لە هەموو کاتێکدا لە سوورەتی «المائدە» ئایەتی (٩٠) دا باسکراوە، ئەمە بە ڕوونی ئاماژە بەوە دەکات کە سێ ئایەتەکە بەرپەرچ و دژی یەك ناوەستێتەوە، ئەگەر وا بووایە ئەوا گونجاو نەدەبوو کە سێ ئایەت بە دوای یەکدا بێت، لە کاتێکدا موسوڵمانان چاوەڕوان دەکرێن پەیڕەوی هەموو ئایەتێك بکەن کە لە قورئاندا هاتووە، تەنها بە شوێنکەوتنی ئایەتی کۆتایی ئەوا ڕازی دەبێت بە شوێنکەوتووی دوو ئایەتەکەی پێشووتر بێت.
وا دابنێ من دەڵێم کە من لێرە ناژیم، دواتریش دەڵێم کە من لە کالیفۆرنیا ناژیم. لەکۆتاییدا دەڵێم کە من لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ناژیم، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ئەم قسانەم دژ بەیەکن، یاخود بەرپەرچی یەك دەدەنەوە، هەر یەکێك لە قسەکان زانیاری زیاتر دەبەخشێت کە ڕستەکەی پێشووتر ئەو زانیارییەی تێدا نییە، چونکە تەنها بە وتنی ئەوەی کە من لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ناژیم ئەوا ڕوونە کە من نە لە لۆس

ئەنجلۆس و نە لە کالیفۆرنیا ناژیم، هاوشێوەی ئەوە بەکارهێنانی مادده کحولییەکان بە تەواوی حەرامکرا، ئەوە ڕوونە کە نوێژکردن لە حاڵەتی سەرخۆشیدا حەرامکراوە و، زانیاری ئەوەی کە خواردنەوە گوناحێکی گەورەیە و سوودێکی تری هەیە بۆ پیاو، بەڵام گوناحەکە لە سوودەکە گەورەترە .

## ٤- قورئان هیچ دژیەکێکی تێدا نییە:

بیرۆکەی هەڵوەشاندنەوە ئەوە ناگەیەنێت کە دژبەیەکی لە قورئاندا بوونی هەیە، هەر چەندە گونجاوە شوێنکەوتەی هەموو ئایەتەکانی قورئان بیت لەهەمان کاتدا، ئەگەر دژبەیەکبوون بوونی هەبوایە لە قورئاندا، کەواتە نابێت قسەی خودا بێت، وەك ئەوەی خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: {أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا} (النساء: ٨٢)، واتە (ئاخۆ ئەو دووڕووانە بۆچی لە مانا و مەبەستی قورئان وردنابنەوە کە چەند ورد و پڕ حیکمەتە خۆ ئەگەر لە غەیری خوا بوبا بێگومان شێواوی و دژایەتییەکی زۆریان تیا بەدی دەکرد بەڵام چونکە فەرموودەی خوایە دەبینی لە هەموو کەم و کورتی و ناتەواوییەك دوورە).

# پرسیاری بیست و پێنجەم
# مانای ئەلیف لام میم

**بۆچی چەند سوورەتێکی قورئان بە « ئەلیف لام میم، ها میم، یاسین» دەست پێدەکات؟ گرنگی ئەو دەستەواژانە چین؟**

## وەڵام/

### ١- وشە کورتکراوەکان:

« ئەلیف لام میم، ها میم، یاسین ...هتد» بە حروفی»موقەتەع» ناسراون، بە مانایەکی تر وشە کورتکراوەکان، لە ئەلیف و بێی زمانی عەرەبیدا (٢٩) وشە هەن (ئەگەر هەمزە و ئەلیف بە دوو پیت هەژماربکرێت) و، (٢٩) سوورەتیشمان هەیە لە قورئانی پیرۆزدا کە بە وشە کورتکراوەکان دەستیانپێکردووە، ئەو وشە کورتکراوانە هەندێك جار بە تەنها و، هەندێك جار بە لێکدراوی دوو وشە و، هەندێك جاریش لێکدراوی سێ وشە و ،چوار و پێنج دەردەکەون.

**یەکەم:** سێ سوورەت بەیەك وشە دەستی پێکردووە:

* سوورەتی «صاد» بە «صاد» دەستی پێکردووە.
* سوورەتی «قاف» بە «قاف» دەستی پێکردووە.
* سوورەتی «القلم» بە «نون»دەستی پێکردووە.

**دووەم:** لێکدراوی دوو وشە:
* سوورەتی «طه» بە «ط» و (هاو) دەستی پێکردووە.
* سوورەتی «النمل» بە (ط) و (سین) دەستی پێکردووە.
* سوورەتی «یاسین» بە (یاء) و «سین» دەستی پێکردووە.

**سێیەم:** (حاء) و « میم» لە حەوت سوورەتی یەك لە دوای یەکدا بوونیان هەیە:
*سوورەتی «غافر».
* سوورەتی «فصلت».
*سوورەتی» الشوری».
*سوورەتی»الزخرف».
*سوورەتی»الدخان».
*سوورەتی»الجاثیة».
*سوورەتی»الاحفاق».

**چوارەم:** «ئەلیف لام میم» لێکدراوی سێ وشە لە شەش سوورەتدا:
* سوورەتی «البقرة».
* سوورەتی «آل عمران».
* سوورەتی «العنکبوت».
* سوورەتی «الروم».
* سوورەتی «لقمان».
* سوورەتی «السجده».

**پێنجەم:** (الف لام راء) لەشەش سوورەتی یەك لە دوای یەكدا:

* سوورەتی «یونس».
* سوورەتی «هود».
* سوورەتی «یوسف».
* سوورەتی «الرعد».
* سوورەتی «ابراهیم».
* سوورەتی «الحجر».

**شەشەم:** «تا، سین، میم» لە دوو سوورەتدا:

* سوورەتی »الشعراء«.
* سوورەتی »قصاص»

**حەوتەم:** لێكدراوی چوار پیت دووجار دەردەكەوێت:

* سوورەتی « الأعراف» بە «ئەلیف لام میم صاد».
* سوورەتی» الرعد» بە «الف لام راء«.

**هەشتەم:** لێكدراوی پێنج پیت دووجار دەردەكەوێت:

*سوورەتی»مریم» بە «كاف، هاء، یا، عەین، صاد».
* الشوری (بە حاء میم عەین سین قاف).

## ٢- مانای ئەو وشە كورتكراوانە:

لە مانا و مەبەستی ئەو پیتە كورتكراوانە لەلایەن توێژەرانی ئیسلامەوە

لێکدانەوەی جیاوازی بۆ دەکرێت، هەندێکی کەم لەو لێکدانەوانە:

**یەکەم:** ئەو پیتانە ڕەنگە کورتکراوە بن بۆ ڕستە و وشە؛ بۆ نموونە: «ئەلیف لام میم» بەمانای «نور» ڕووناکی دێت.
**دووەم:** ئەو پیتانە کورتکراوە نین، بەڵکو هێماو ناوی خودای گەورەن، یان هەر شتێکی تر.
**سێیەم:** ئەو پیتانە وەکو سەروا بەکارهاتوون.
**چوارەم:** ئەو پیتانە هەندێك گرنگی ژمارەییان هەیە، وەکو پیتی سامییەکان، هەروەها بەهای ژمارەییان هەیە.
**پێنجەم:** ئەو پیتانە بەکارهاتوون بۆ ڕاکێشانی سەرنجی پێغەمبەر (د.خ) و گوێگرانی، چەندین بەرگ نوسراون لەسەر گرنگی ئەم پیتە کورتکراوانە.

## ٣- باشترین لێکدانەوە بۆ پیتە کورتکراوەکان:

لە هەموو ئەو لێکدانەوانەی کە لەلایەن توێژەرانەوە لێکدانەوەیان بۆ کراوە، ئەوەی کە ڕاستە لەلایەن تەفسیری ئبن کەسیر و زەمەخشەری، یان ئبن تەیمیەوە پشتگیری و پەسەندکراوە ئەمەی خوارەوەیە:
جەستەی مرۆڤ لە چەندین توخمی بنچینەیی جیاواز پێکهاتووە کە لە سروشتدا دۆزراوەتەوە؛ لەوانە خۆڵ و تۆز، هێشتا ڕەنگە گاڵتەجاڕی بێت بڵێیت کە مرۆڤایەتی کتومت هاوشێوەی خۆڵە، ئێمە دەتوانین هەموو ئەو توخمانەی کە مرۆڤی لێ دروست بووە هەبێت و، گاڵۆنێك ئاوی بۆ زیاد بکەین کە بونیادی جەستەی مرۆڤە، ئێمە توخمەکانی جەستەی مرۆڤ دەزانین و هێشتا ئێمە ون دەبین کاتێك پرسیار سەبارەت بە نهێنی ژیان

دەکرێت.

هاوشێوەی ئەمە قورئان ئاماژە بۆ ئەو خەڵکانە دەکـات کە ئەوە ڕەتدەکەنەوە کە دەسەڵاتێکی خوایی ئاسمانییە، پێیان دەڵێت کە ئەم قورئانە لە زمانی خۆتانە کە شانازی پێوە دەکەن، کە پێکهاتووە لە هەندێك پیت کە عەرەبەکان زۆر بە ڕەوانی مەبەستەکانی خۆیانی پێ دەردەبڕن.
عەرەبەکان زۆر شانازی بە زمانەکەیانەوە دەکەن و، ئەو کاتەی قورئان دابەزی زمانی عەرەبی لە لووتکەدا بوو، لەگەڵ پیتەکانی وەکو: **«ئەلیف لام میم/ یا، سین/ هاء ، میم ...هتد»** لە زمانی ئینگلیزیدا دەتوانین بڵێین «A,B,C,D». قورئان بەرەنگاری مرۆڤەکان دەبێتەوە بۆ بەرهەمهێنانی بەلایەنی کەمەوە یەك سوورەت بە جۆرێك لە جۆرەکان هاوشێوەی قورئان بێت لە جوانی و ڕێکوپێکیدا، ئەگەر گومانیان لە ڕاست و دروستی قورئان هەیە.

لە پلەی یەکەمیدا قورئان بەرەنگاری هەموو پیاوەکان و جنییەکان دەبێتەوە بۆ بەرهەمهێنانی شتێك هاوشێوەی قورئان، ئەم بەرەنگاربوونەوەیە لە سوورەتی **(الإسراء)** ئایەتی (٨٨) **(پێشتر ڕاڤەکراوە)**، دواتر قورئان ئەو بەرەنگاربوونەوەیە دووبارە دەکاتەوە لە سوورەتی (هود) ئایەتی (١١) (پێشتر ڕاڤەکراوە)، بە وتنی ئەوەی کە (دە) سوورەت بەرهەم بهێنێت وەکو ئەو «خوا»یە، دواتر پێیان دەفەرموێت: تەنانەت (یەك) سوورەت بەرهەم بهێنێت؛ ئەویش لە سوورەتی (یونس) ئایەتی (٣٨) (پێشتر ڕاڤەکراوە)، لە کۆتاییدا ئاسانترین بەرەنگاربوونەوە لە سوورەتی (البقرة)دا

خوای گەورە ئاماژەی پێکردووە لە سوورەتی (البقرة)دا ئایەتی (٢٣ و ٢٤) (پێشتر ڕاڤەکراوە).

بۆ بەراوردکردنی لێهاتووی دوو بەهرەمەند ئەوا پێویستە هەمان ماددەی خاویان پێبدەیت بۆ ئەوەی هەڵیانبسەنگێنیت لەهەمان ئەرکدا، ئەگەر ئەو دوو بەهرەمەندە بەرگدروو بوون؛ ئەوا پێویستە هەمان قوماشیان پێبدەیت، ماددە خاوەکانی زمانی عەرەبی ئەم پیتانەن: «ئەلیف لام میم»،»یا سین»، ...هتد **(لە ئینگلیزیدا A,B,C,D)** سروشتی موعجیزەی زمانی قورئان؛ تەنها ناکەوێتە سەر ئەو ڕاستییەی کە ئەوە قسەی خوایە، بەڵکو دەکەوێتە سەر ئەو ڕاستییەش کە لە چەند پیتێکەوە دروستبووە، کە بت پەرستە عەرەبەکان شانازییان پێوەدەکرد کە بەربەرەکانی ناکرێن. عەرەبەکان بە توانای ڕەوانبێژ و قسەڕەوانی و دەربڕینی پڕ مانا تێبینی دەکرێن، هەر وەکو بونیادی جەستەی مرۆڤ کە بۆ ئێمە دانراوە کە لەلایەن ئێمە ناتوانرێت بە دەستبهێنرێت، ئەو پیتانەی کە قورئان پێکدەهێنن وەکو **(ئەلیف لام میم ...)** ناسراون بۆ ئێمە و، بە شێوەیەکی بەردەوام بۆ پێکهێنانی وشەکان بەکاردەهێنرێت. ناتوانرێت ژیان لەلایەن ئێمەوە دروست بکرێت؛ هەرچەندە ئەو زانیارییانەمان هەبێت لەبارەی بونیادی جەستەی مرۆڤەوە، هاوشێوەی ئەمە ئێمە ناتوانین ئەو جوانی و ڕەوانبێژییەی قورئان بەدەستبهێنین؛ لەگەڵ ئەوەی ئەو پیتانە دەزانین کە قورئانی لێ پێکهاتووە، چونکە قورئان بنچینەیەکی ئاسمانی خودایە.

## ٤- موعجیزەی قورئان ڕاستەوخۆ دوای ئەو پیتە لێکدابڕاوانە ئاماژەی پێکراوە:

هەرچەندە ڕاستەوخۆ دوای ئەو پیتە لێکدابڕاوانە کە لە قورئاندا ئاماژەی پێکراوە، لەم چەند ئایەتەی خوارەوە خودا سەبارەت بە موعجیزەی قورئان و دەسەڵاتەکەی قسە دەکات: {الم (١) ذَلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ} (البقرة: ١-٢)، واتە (ئەم کتێبە «قورئان» بۆ کەسێك کە تێبفکرێ هیچ گومانێکی تێدا نییە کە لەلایەن خواوە هاتووە، نور و ڕێنماییە بۆ موسوڵمانە پارێزکارەکان).

# پرسیاری بیست و شەشەم
# ئایا قورئان وتویەتی کە زەوی تەختە؟

**قورئان دەڵێت کە خوا زەوی وەکو فەرشێک دروستکردووە بۆتان، ئەمە ئەوە دەردەخات کە زەوی تەختە، ئایا ئەوە ناچوونیەکی نییە لەگەڵ زانستی سەردەمدا؟**

## وەڵام/

### ١- زەوی وەکو فەرشێك دروستکراوە.

پرسیارەکە ئاماژە بۆ ئایەتێکی قورئان لە سوورەتی (نوح) دەکات: {وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ بِسَاطًا} (نوح: ١٩)، **واتە: (وە هەر ئەو خوایە زەوی بۆ ئێوە ڕاخستووە بەڕاخستنێك لەسەری قەرار بگرن)**، بەڵام ئەو ڕاستییەی ئایەتەکەی سەرەوە تەواو نەبووە بەردەوام دەبێت بۆ ئایەتی دوای خۆی کە لێکدانەوە بۆ ئایەتی پێشووتر دەکات: {لِتَسْلُكُوا مِنْهَا سُبُلًا فِجَاجًا} (نوح: ٢٠)، واتە: (تا بەئاسانی بەڕێگا فراوان و دۆڵەکانیدا بڕۆن).

هەمان پەیام لە سوورەتی «طه»دا دووبارەبووەتەوە: {الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْدًا وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ أَزْوَاجًا مِنْ نَبَاتٍ شَتَّى} (طه: ٥٣)، واتە: (ئەو خوایەی کە زەوی بارهێناوە و کردوویەتی بە لانك و بێشکە بۆ ئێوە تا زۆر بەئاسانی تیایدا بژین، وە چەند ڕێگا و ڕێبازێکی بۆتان تێیدا دروستکرد تا لە ناو شاخ و دەشتیدا بە ئاسانی هاتوچۆ بکەن).

ئەستووری توێکڵی زەوی کەمترە لە (٣٠ میل) کە ئەویش زۆر تەنکە بەراورد بە نیوە تیرەی زەوی کە نزیکەی (٣٧٥٠ میل) دەبێت، چینە قووڵاییەکانی زەوی زۆر گەرم و شل و نەیارە بۆ هەموو شێوازێکی ژیان، توێکڵی زەوی توێکڵێکی ڕەقە کە دەتوانین لەسەری بژین، قورئان زۆر بە ئاشکرا ئاماژەی بۆ دەکات کە وەکو فەرشێکی ڕاخراو و فراوان وایە کە دەتوانین گەشت بکەین بە درێژایی ڕێگا و شوێنەکانیدا.

## ٢- فەرش دەتوانرێت زیاتر فراوانتر بێت لە هەر ڕوویەکی تەواو ڕەق:

تەنانەت یەك ئایەتیش لە قورئاندا نییە بفەرموێت کە زەوی تەختە، قورئان تەنها بەراوردی نێوان توێکڵی زەوی دەکات لەگەڵ فەرشێکدا، هەندێك خەڵك وا دەزانن کە فەرش تەنها دەتوانرێت لەسەر ڕوویەکی تەخت رابخرێت، ئەوە گونجاوە کە فەرش دەتوانرێت لەسەر خڕ و گۆییش ڕابخرێت وەکو زەوی، ئەوە بە ئاسانی دەردەکەوێت کە جیهان بە فەرشێك داپۆشراوە. فەرش یان کومبار بەشێوەیەکی گشتی لەسەر ڕوویەك دادەنرێت کە زۆر ئاسوودە نەبێت کە بەسەریدا بڕۆیت، قورئان وەسفی توێکڵی زەوی دەکات بە فەرشێك کە بە بێ ئەوە مرۆڤەکان ناتوانن بژین و بمێننەوە؛ بەهۆی گەرمی و شلی چینەکانی ژێر زەوی.

## ٣- زەوی لەیەك جیابووەتەوە:

هاوشێوەی ئەوە، قورئان لە چەند ئایەتێکدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە زەوی لەیەك جیابووەتەوە: {وَالْأَرْضَ فَرَشْنَاهَا فَنِعْمَ الْمَاهِدُونَ} (الذاريات:

٤٨)، واته: (زەویشمان ڕاخست بۆ ژیان ئای چ ڕاخەرێکی چاکین ئێمە).
هاوشێوەی ئەوە، قورئان لە چەند ئایەتێکدا باسی ئەوە دەکات کە زەوی شوێنێکی کراوە و فراوانە: {أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا (٦) وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا (٧)} (النبأ:٦-٧)، واته: (ئەرێ ئێمە ئەو زەویەمان نەکردۆتە لانك و بێشکە و جێی ئارامگرتن بۆتان، ئەی چیا و کێوەکانیشمان وەك مێخ بۆ دانەکوتیون و زەویمان پێ نەبەستووە؟).

لە هیچ کام لەو ئایەتانە قورئان ئەوە دەرناخات کە زەوی تەختە، تەنها ئەوە دەردەخات کە زەوی شوێنێکی فراوانە و هۆکاری فراوانییەکەشی ئاماژەی پێکراوە، قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: {يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ أَرْضِي وَاسِعَةٌ فَإِيَّايَ فَاعْبُدُونِ} (العنكبوت: ٥٦)، واته: (ئەی ئەو بەندانەی باوەڕتان هێناوە بەڕاستی زەوی من پان و فراوانە، ئەگەر نەتانتوانی لە جێگەیەك بە ئازادانە پەرستش بکەن بگوێزنەوە بۆ جێگایەکی تر).

## ٤- زەوی شێوەیەکی گۆیی هەیە:

قورئان ئاماژەی بە شێوەی ڕاستەقینەی زەوی کردووە: {وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَاهَا} (النازعات: ٣٠)، واته: (دوای ئاسمانیش زەوی بەشێوەیەکی هێلکەیی بەدیهێناوە بۆ نیشتەجێبوون و حەوانەوەتان).

«دحاها» لە وشەی «دوحیا»وە وەرگیراوە، کە بەتایبەت ئاماژەیە بۆ هێلکەی نەعامە کە شێوەی گۆییە بە دروستی هەمان شێوەی زەوی، کەواتە قورئان و زانستی مۆدێرن بە تەواوی گونجاون.

# پرسیاری حەوتەم

## ئایا تەنها خوا ڕەگەزی منداڵ لە منداڵدانی دایکیدا دەزانێت؟

**قورئان دەڵێت کە تەنها خوا ڕەگەزی منداڵ لە منداڵدانی دایکیدا دەزانێت، بەڵام زانستی ئێستا پێشکەوتووە و بە ئاسانی ڕەگەزی منداڵ لە منداڵدانی دایکیدا دیاری دەکات لە ڕێگەی ئامێری سەروو دەنگییەکانەوە، ئایا ئەم ئایەتەی قورئان ناچوونیەک نییە لەگەڵ زانستی پێشکەوتوودا؟**

## وەڵام/

خوا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە و هەموو شتێکیش دەزانێت، خوا زانیاری لەسەر ئەو شتانە هەیە کە دەبینرێن و ئەو شتانەش کە نابینرێن.

### ١- خوا بە هەموو شتێك دەزانێت:

زۆرێك لە خەڵك بڕوایان وایە کە قورئان بانگەشەی ئەوە دەکات کە تەنها خوا ڕەگەزی منداڵ دەزانێت لە منداڵدانی دایکیدا، قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: {إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ} (لقمان: ٣٤)، واتە: (بەڕاستی زانیاری هاتنی ڕۆژی قیامەت

هەر لای خوایە، تەنها ئەویش باران دەبارێنێ لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا، ئەویش ئەزانێ چی لە منداڵدانەکاندایە، هیچ کەسێك سەد لەسەد نازانێت سبەینێ چی دەکا لە چاك و خراپ، هیچ کەسیش نازانێ لەکام سەر زەوی ئەمرێ، هەر خوایە زانا و بە ئاگایە بەتەواوی ڕووداوەکان و گشت نهێنی و ئاشکرایەکیشی لا یەکسانە)، پەیامی هاوشێوەی ئەو ئایەتەی سەرەوە لە قورئاندا هاتووە خوای گەورە دەفەرموێت: {اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنْثَى وَمَا تَغِيضُ الْأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ وَكُلُّ شَيْءٍ عِنْدَهُ بِمِقْدَارٍ} (الرعد: ٨)، واتە: (لە پژدان و هەموو مێینەیەکدا (ژن، ئاژەڵ) هەرچی تێدابێ پێش داریدانی نێر و مێ خوا دەیزانێ و تەنها هەر ئەویش ئاگادارە پێی، وە هەر ئەویش دەزانێت کە منداڵدانەکان چێیان لێ کەم دەبێتەوە واتە لەبار دەچێ وە یان پتر لە ماوەی ئاسایی خۆیان دەژین، هەموو شتێکیش بەلای خواوە ئەندازەیەکی دیاریکراوی هەیە، ماوەی لە دایکبوونی بە ئاسایی یان بە نائاسایی، رزق و رۆزیی، ئاکام مەرگی، بەختیاریی و بەدبەختی).

## ٢- ڕەگەز لە ڕێگەی ئامێری سەروو دەنگییەکانەوە دیاری دەکرێت:

ئەمڕۆ زانست زۆر پێشکەوتووە و دەتوانن زۆر بە ئاسانی ڕەگەزی منداڵ لە منداڵدانی دایکی دووگیاندا لە ڕێگەی بەکارهێنانی ئامێرە سەروو دەنگییەکانەوە دیاری بکەن.

٣- وشەی «ڕەگەز» ئاماژەی پێنەکراوە لە ئایەتی قورئاندا، ئەوە ڕاستە کە زۆرێك لە وەرگێرکاران و ڕاڤەکەرانی ئەم ئایەتە پیرۆزەی قورئان کە دەڵێ

تەنها خوا ڕەگەزی منداڵ دەزانێت لە منداڵدانی دایکیدا، ئەگەر تۆ دەقە عەرەبیەکەی ئەم ئایەتە بخوێنیتەوە هیچ وشەیەکی عەرەبی تێدا باس نەکراوە کە ئاماژەبێت بۆ «ڕەگەز»، لە ڕاستیدا قورئان دەفەرموێت کە زانینی ئەوەی کە چی لە منداڵدانی ئافرەتدا هەیە، تەنهای لەلای خوایە، زۆرێك لە ڕاڤەکاران بە هەڵە لێی تێگەیشتوون و ئاماژە بەوە دەکەن ئەو ئایەتە بە مانای ئەوە دێت کە تەنها خوا ڕەگەزی منداڵەکە دەزانێت کە لە منداڵدانی دایکیدا هەیە، کە ئەمەش تێگەیشتنێکی هەڵەیە.

## ٤- هیچ کەسێك بێجگە لە خوا ناتوانێت بڕیار لەسەر سروشتی منداڵ بدات:

ئەم ئایەتە ئاماژە نییە بۆ ڕەگەزی منداڵ لە منداڵداندا، بەڵکو ئاماژەیە بۆ منداڵ لە منداڵدانی دایکیدا چۆن دەبێت، سروشتی چۆن دەبێت؟ ئایا بەرامبەر بە دایك و باوکی میهرەبان یان دڵ ڕەق دەبێت؟ ئایا دەبێتە نیعمەت یان بەڵا بۆ کۆمەڵگا؟ ئایا باش یان خراپ دەبێت؟ ئایا دەچێت بۆ بەهەشت یان جەهەننەم؟ تەواوی ئەو زانیارییانە تەنها لای خوا دەبێت، هیچ زانایەك نییە لە جیهاندا گرنگ نییە کە چەندە ئامێرەکانی پێشکەوتوون؛ ناتوانێت ئەو زانیارییانەی دەست بکەوێت لەسەر منداڵێك لە منداڵدانی دایکیدا.

# پرسیاری بیست و هەشتەم / حۆری

**بە پێی قورئان کاتێک پیاوێک دەچێتە بەهەشت حۆری دەدرێتێ؛ کە ئافرەتی جوانن، ئایا ئافرەت چی پێ دەدرێت کاتێک دەچێتە بەهەشت؟**

## وەڵام/

### ١- حۆری لە قورئاندا ئاماژەی پێکراوە لە چوار شوێندا:

* {كَذَلِكَ وَزَوَّجْنَاهُمْ بِحُورٍ عِينٍ} (الدخان: ٥٤)، واتە (هەروا وەسفمان کرد بۆت، هاوجووتمان کردوون، بە ژنانی سپی و چاوگەورە).
* (مُتَّكِئِينَ عَلَى سُرُرٍ مَصْفُوفَةٍ وَزَوَّجْنَاهُمْ بِحُورٍ عِينٍ) (الطور: ٢٠). واتە: (لەسەر قەنەفەی ریزکراو پاڵیانداوەتەوە و ڕوویـان لەیەك کردووە، هاوسەرمان کردوون بە ژنانی سپی چاوگەورە).
* {حُورٌ مَقْصُورَاتٌ فِي الْخِيَامِ} (الرحمن: ٧٢). واتە: (ژنانی سپی چاو ڕەشن لەناو خێوەت و چادرەکاندا دەرناچن).
* {وَحُورٌ عِينٌ} (الواقعة: ٢٢). واتە: (ژنانی چاو بەڵەك و چاو گەورە و سپی پێست و دەم و چاو درەخشانیان بۆ هەیە).

### ٢- حۆری بە مانای «کچی جوان» وەرگێردراوە

زۆرێك لە وەرگێڕەرانی قورئان وشەی حۆرییان بە کچی جوان وەرگێڕاوە، ئەگەر حۆری بە مانای کچی جوان بێت ئەی کەواتە ئەوە بە مانای ئەوە

دێت کە تەنها بۆ پیاوە، ئەی ئافرەتتان لە بەهەشتدا چی بەدەستدەهێنن؟

### ٣- ماناى (حوور، يان حۆرى):

وشەی «حۆر» شێوەی کۆی (حوار) پەیوەست بە پیاوان و (حوراء) پەیوەست بە ئافرەتان؛ کە بە مانای کەسێك نێر یان مێ کە لە بە هەشتدا ئاماژەیە بۆ کەسێك زۆر سپییە و چاوێکی ڕوحانی هەیە، لە قورئاندا لە چەند ئایەتێکدا وەسفی کراوە کە لە بەهەشتدا هاوسەرت دەبێت کە بە مانای جووت یان هاوڕێ دێت: {وَبَشِّرِ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ كُلَّمَا رُزِقُوا مِنْهَا مِنْ ثَمَرَةٍ رِزْقًا قَالُوا هَذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِنْ قَبْلُ وَأُتُوا بِهِ مُتَشَابِهًا وَلَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ وَهُمْ فِيهَا خَالِدُونَ} (البقرة: ٢٥). واتە: (ئەی پێغەمبەر مژدە بدە بەوانەی کە بڕوایان بە خوا و پێغەمبەر و ڕۆژی دوایی هەیە و ئاکارە چاك و پەسەندەکان ئەنجام دەدەن، کە بێگومان بەهەشت گەلێکیان بۆ هەیە کە چەندین کانیاو و رووبار لە ژێر درەختەکانیدا دێن و دەچن، هەر کە لەو بەرهەم و میوەی بەهەشتانەیان بۆ دێنن و دەیچێژن، ئەو میوەجاتەی لەبەهەشتا بۆیان دەهێنرێ هەموو لە چاکی و باشیدا بەرەنگ لەیەك دەچن، لەو بەهەشتەدا چەندین ئافرەت و هاوسەری پاك و خاوێنیان بۆ ئامادەکردووە و بە هەتا هەتاییش لەوێ ئەمێننەوە و ژیانێکی خۆش دەبەنە سەر)، هەروەها: {وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا لَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ وَنُدْخِلُهُمْ ظِلًّا ظَلِيلًا} (النساء: ٥٧)، واتە: (ئەو کەسانەش کە کە باوەڕیان هێناوە و کارە چاکەکانیان ئەنجامداوە، بێگومان لە دوارۆژدا ئەیانبەینە ناو باخ و باخاتی وەهاوە کە بە بن درەختەکانیدا

کانی و ڕووبار دێت و دەڕوا، هەتا سەریش لەوێ دەمێننەوە، ژنانی پاك و خاوێنیان دەدەینێ کە لە هەموو شتێکی ناڕەوا و قێزەون دوورن، وە دەشیانبەینە بن سێبەری چڕوپڕەوە ئیتر لەوێ نەسەرما و نەگەرما تینیان تێناکات لەم ئایەتەدا سێبەری بەهەشت بە وشەی (ظلیل) هاتووە).

کەواتە وشەی «حۆر» هیچ ڕەگەزێکی دیاریکراوی نییە، محەمەد ئەسەد وشەی «حۆر»ی بە هاوژین وەرگێراوە و، عبدالله یوسف بە (هاوڕێ) وەرگێڕاوە، هەرچەندە بە گوێرەی هەندێك لە توێژەران پیاو لە بەهەشتدا حۆری دەدرێتێ کە کچی جوانن کە چاوێکی گەورە و درەوشاوەیان هەیە، ئافرەتیش لەبەهەشتدا پیاوێکی دەدرێتێ کە چاوێکی گەورەی درەوشاوەی هەیە.

## ٤- ئافرەتان لە بەهەشتدا شتێکی نائاسایی بەدەستدەهێنن:

زۆرێك لە ناوەڕۆکی توێژەران ئەوە دەڵێن کە وشەی «حۆر» کە لە قورئاندا ئاماژەی بۆ کراوە، ئاماژەیە بۆ کچی جوان کە ڕەگەزەکەی دیاریکراوە، دەسەڵاتێك کە ڕەنگە لەلایەن هەموو جۆرە خەڵکێکەوە قبوڵ بکرێت، ئەمیش لە فەرموودەدا وەڵامی دراوەتەوە بەوەی کە ئافرەتان شتێکیان دەستدەکەوێت کە دڵ ئـارەزووی نەکردووە، گوێ نەیبیستووە، چاو نەیبینیوە، بە مانای ئەوە دێت کە ئافرەتانیش لە بە هەشتدا شتێکی نائاسایی بە دەستدەهێنن.

# پرسیاری بیست و نۆیەم
# ئایا دڵ بەرپرسیارە لە تێگەیشتن؟

**لە قورئاندا ئاماژە بەوە کراوە کە خوا دڵی کافرەکانی داخستووە و بڕوا ناهێنن. زانست ئەمڕۆ ئەوەمان پێدەڵێت کە مێشک بەرپرسە لە تێگەیشتن و بڕواهێنان نەک دڵ، ئایا قورئان لەگەڵ زانست ناچوونیەک نییە؟**

## وەڵام/

١- خوا دڵی کافرەکانی داخستووە، لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: {إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَأَنْذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنْذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ (٦) خَتَمَ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ وَعَلَى سَمْعِهِمْ وَعَلَى أَبْصَارِهِمْ غِشَاوَةٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ (٧)} (البقرة: ٦-٧)، واتە: (بێگومان ئەوانەش سەبارەت بە بەڵگە و ئایەتەکانی خوا، خوانەناس و بێباوەڕن، وەك یەك وایە بۆیان، ئایا بیانترسێنی یان نەیانترسێنی، هەر باوەڕ ناهێنن، چونکە خوا بەهۆی گوناه و سەرپێچییانەوە مۆری بەدبەختی بەسەر دڵ و گوێیاندا ناوە هەرگیز ڕۆشنایی و بڕوایان تێناچێ و هەق نابیستن).

### ٢- وشەی (قلب) لە عەرەبیدا بە مانای دڵ، هەروەها زیرەکی دێت:

وشەی «قلب»ی زمانی عەرەبی لەم چەند ئایەتەدا بەمانای دڵ دێت، هەروەها بە مانای زیرەکیش دێت، بەو شێوەیە ئەو ئایەتەی سەرەوە

مانایەکی تر دەبەخشێت ئەویش ئەوەیە کە دەرگای زیرەکی کافرەکانی داخستووە و بە شێوەیەك کە ناتوانن تێبگەن و بڕوابهێنن.

## ٣- لە زمانی عەرەبیدا دڵ بە مانای چەقی تێگەیشتنیش دێت:

لە زمانی عەرەبیدا دڵ لە پاڵ ماناکەی خۆیدا بە مانای سەنتەر و چەقی تێگەیشتنیش دێت.

## ٤- چەندین وشە کە لە زمانی ئینگلیزیدا بەکارهاتووە و، لە مانا ڕاستەقینەکەیەوە جیاوازن:

تەنانەت لە زمانی ئینگلیزیدا چەندین وشە هەن کە بەکاردێت بۆ شیکردنەوەی شتێك، لە کاتێکدا مانا ڕاستەقینەکەی ئەو وشانە جیاوازن لەگەڵ بەکارهێنانەکەیدا وەك ئەم وشانەی خوارەوە:

*** Disaster:**

وشەی «**Disaster**» بە مانای ئەستێرەیەکی خراپ دێت، بەڵام لە ئێستادا بە مانای کارەساتێکی گەورە دێت. هەمووومان ئەوە دەزانین کە ئەو دوو مانایە بۆ یەك وشە چەند لێك دوورن.

*** Trivial:**

وشەی «**Trivial**» بە مانای سێ ڕێگا دێت کە یەك دەگرن، بەڵام لە ئیستادا ئەم وشەیە بەکاردێت بۆ شتێکی هیچ و کەم بایەخ، سێ ڕێگا بەیەك دەگەن

لە ڕووی بەکارهێنانەوە زۆر جیاوازە لە شتێك کە هیچ و کەم بایەخ بێت.

*** «Sunrise» و «Sunset»:**

وشەی «**Sunrise**» بە مانای هەڵهاتنی خۆر دێت، وە لەمڕۆدا وشەی «**Sunrise**» زۆر بەکاردێت، لەکاتێکدا زۆر کەس ئەوە دەزانن کە زەوی بـەدوری خۆیدا و بە دەوری خـۆردا دەسووڕێتەوە، زۆرێـك لە ئێمە ئەوە دەزانین کە ڕۆژ هەڵنایەت لە ماوەی ڕۆژهەڵاتندا، هەرچەندە ئەستێرەناسەکانیش ئەو وشەی «خۆرهەڵاتن»ە بە کاردێنن، هاوشێوەی ئەمە لەکاتی «**Sunset**» خۆرئاوابووندا خۆر بە شێوەیەکی کرداری ئاوا نابێت.

## ٥- لە زمانی ئینگلیزیدا دڵ چەقی خۆشەویستی و سۆزە:

لە زمانی ئینگلیزیدا «دڵ» بەو ئەندامەی جەستە دەوترێت کە پاڵ بە خوێنەوە دەنێت بۆ ئەندامەکانی لەش، هەمان وشە بەکاردێت بەمەبەستی چەقی بیرکردنەوە و خۆشەویستی و سۆز. ئەمڕۆ ئێمە ئەوە دەزانین کە مێشك چەقی بیرکردنەوە و خۆشەویستی و سۆزە، هێشتا لە کاتی دەربڕینی سۆزدا بەرامبەر بە کەسێك دەڵێین: **«من تۆم لە قووڵایی دڵمەوە خۆشدەوێت» خەیاڵ بکە کە زاناکان بە هاوسەرەکانیان دەڵێن: «من تۆم لە قووڵایی دڵمەوە خۆشدەوێت» خێزانەکانیشیان هەمان وەڵام دەدەنەوە. تەنانەت بنەماکانی زانستیش نازانن، کە مێشك بەرپرسە لە سۆز نەك دڵ؟ بەڕاستی بەشێوەیەکی زانستی پێویستە بڵێین: «من تۆم لە قووڵایی مێشکمەوە خۆشدەوێت».**

**٦- عەرەبەکان دەزانن کە وشەی دڵ لەزمانی عەرەبیدا بۆ مەبەستی چەقی بیرکردنەوە و تێگەیشتن بەکاردێت:**

هیچ عەرەبێك هەرگیز پرسیاری ئەوە ناکات کە بۆچی خوا دڵی کافرەکانی داخستووە؟ چونکە دەزانێت کە لە ناوەڕۆکدا ئاماژەیە بۆ چەقی بیرکردنەوە و تێگەیشتن و سۆز.

# پرسیاری سییەم
# خوا دڵی کافرەکانی داخستووە؟

**ئەگەر خوا دڵی کافرەکانی داخستووە بۆچی لۆمە دەکرێن کە ئیسلام قبوڵ ناکەن؟**

## وەڵام/

**١- خوا دڵی ئەوانەی داخستووە کە بە شێوەیەکی بەردەوام ڕاستی ڕەتدەکەنەوە:**

خوا لە قورئاندا ئاماژەی پێکردووە **(البقرة: ٦-٧)**، (پێشتر ئەم ئایەتە ڕاڤەکراوە).

ئەو ئایەتەی سەرەوە ئاماژە نییە بۆ ئەو کافرانەی کە بڕوا ناهێنن، (الَّذِينَ كَفَرُوا) ئەم وشە عەرەبییە بەکاردێت بۆ ئەوانەی کە ڕاستی ڕەتدەکەنەوە، هیچ جیاوازییەکی نییە ئەگەر ئەو کەسانە ئاگادار بکرێنەوە یان نا، ئەوا هەر بڕوا ناکەن، خوا دڵ و بیستن و چاویانی داخستووە، نەك لەبەر ئەوەی کە خوا دڵی داخستوون ئەو کافرانە تێناگەن و بڕوا ناکەن؛ بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئەوان ئەگەر ڕاستیەکانیان پێ بوترێت و ئاگاداریش بکرێنەوە ئەوا هەر تێناگەن و باوەڕ ناهێنن و ڕاستییەکان ڕەتدەکەنەوە، کەواتە خودا بەرپرسیار نییە لەمە، بەڵکو خۆیان بەرپرسن.

## ٢- نموونەی ئەو مامۆستایەی کە پێشبینی ئەوە دەکات کە خوێندکارێك دەردەچێت:

وا دابنێ کە مامۆستایەکی شارەزا پێش تاقیکردنەوەی کۆتایی پێشبینی ئەوە دەکات کە خوێندکارێك لە تاقیکردنەوەکەدا دەکەوێت و دەرناچێت، لەبەرئەوەی کە خوێندکارەکە کەمتەرخەمە و زۆر گرنگی بە وانەکەی نادات و، ئەرکەکانی ماڵەوەی ئەنجام نادات، ئەگەر دوای تاقیکردنەوەکە دەرکەوت خوێندکارەکە دەرنەچووە کێ دەبێت لۆمە بکرێت؟ خوێندکارەکە یان مامۆستاکە؟ تەنها لەبەرئەوەی مامۆستاکە پێشبینی ئەوەی کردووە ئەوە بە مانای ئەوە نایەت کە دەبێت مامۆستاکە لۆمە بکرێت، بەڵکو خوێندکارەکە خۆی بەرپرسیارە لە دەرنەچوونی. هاوشێوەی ئەمە خوا خۆی لە پێشدا دەزانێت کە هەندێك خەڵك کە ڕاستی ڕەتدەکەنەوە و بڕوای پێناهێنن و خواش دڵی داخستوون؛ کەواتە ئەو کەسانە خۆیان دەبێت بەرپرسیارێتی ڕەتکردنەوە بگرنە ئەستۆ.

# پرسیاری سی و یەکەم

## ئاسمان و زەوی لە شەش ڕۆژدا دروست کراوە نەک هەشت ڕۆژ:

**قورئان لە چەندین شوێن ئاماژەی بەوە کردووە کە ئاسمان و زەوی لە ماوەی شەش ڕۆژدا دروستکراوە، بەڵام لە سوورەتی «فصلت»دا ئاماژەی بەوە کردووە لە هەشت ڕۆژدا ئاسمان و زەوی دروستکراوە، ئایا ئەم دوو قسەیە دژ بەیەک نین؟ هەمان ئایەت دەڵێت کە زەوی لە شەش ڕۆژ و ئاسمان لە دوو ڕۆژدا دروستکراوە: ئەمە دژی بیرۆکەی تەقینەوە گەورەکەیە کە تێیدا زەوی و ئاسمان لە شەش ڕۆژ لە هەمان کاتدا دروستبوون.**

## وەڵام/

### ١- ئاسمان و زەوی لە شەش ڕۆژدا دروستکراون:

من هاوڕام لەگەڵ ئەوەی کە قورئان ئاماژەی بۆ دەکات کە زەوی و ئاسمان لە ماوەی شەش ڕۆژدا دروستبوون، لەم چەند ئایەتەی خوارەوەی قورئانی پیرۆزدا باسکراوە:

* {إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ} (الأعراف: ٥٤)، واتە:

(بەڕاستی هەر خوای پەروەردگاری ئێوە بوو توانی ئاسمانەکان و زەوی لە ماوەی شەش ڕۆژدا دروست بکات، ئەوساش بەو شێوەیەی کە شایستە و شیاوی زاتی خۆی بێت چووە سەر عەرشی فەرمانڕەوایەتی خۆی، ڕۆژ بە شەو دادەپۆشێ و ڕۆژیش بەپەلە دەکەوێتە شوێنی شەو، خۆر و مانگ و گشت ئەستێرەکانی دروست کرد، هەمووشیان لەژێر دەستی ئەودا ڕامکراون و بەپێی یاسای ئەویش دێن و دەچن، چاکیش بزانن کە دروست کردن و تەکبیر و فەرمانی بۆ بەڕێوەبردنی هەموو بوونەوەر هەربەدەستی ئەوە، زۆر بەبەرەکەت و گەورەیە خوایەك کە پەروەردگاری گشت جیهانە).

* {إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُدَبِّرُ الْأَمْرَ مَا مِنْ شَفِيعٍ إِلَّا مِنْ بَعْدِ إِذْنِهِ ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ} **(یونس: ٣)**، واتە: **(بەڕاستی پەروەردگارتان هەر ئەو خوایەیە کە ئاسمانەکان و زەوی لەماوەی شەش ڕۆژدا دروستکرد، پاشان بەو شێوەیە کە شایستە و شیاوی زاتی ئەو بێت و خۆی مەبەستیەتی چوویە سەر عەرشی فەرمانڕەوایی خۆی، بەتەنیا بۆ خۆی کاروباری جیهان بەڕێوەدەبا، خۆی بەدواوە هیچ تکاکارێك نییە تکای بۆ بکات مەگەر کەسێك خۆی مۆڵەتی بدات، هەر ئەو خوایەیە پەروەردگارتان دەسا ئێوەش هەر ئەو بپەرستن، ئاخۆ پەند و ئامۆژگاری وەرناگرن و وردنابنەوە لەو هەموو بوونەوەرە).**

* {وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَلَئِنْ قُلْتَ إِنَّكُمْ مَبْعُوثُونَ مِنْ بَعْدِ الْمَوْتِ لَيَقُولَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ هَذَا إِلَّا سِحْرٌ مُبِينٌ} (هود: ٧)، واتە: (هەر ئەو خوایەیە

ئاسمانەکان و زەوی لەماوەی شەش ڕۆژدا دروستکرد، و هێمای تەخت و عەرشەکەشی هەر لەسەر ئاوبوون، ئەم بوونەوەری دروستکرد بۆ ئەوەی تاقییان بکاتەوە ئایا کامتان کردەوەتان چاکترە، سوێند ئەخۆم ئەگەر بشڵێیت بێ شك ئێوە پاش مردن زیندوو ئەکرێنەوە و تۆڵە دەدرێن، بە دڵنیاییەوە ئەوانەی کافر و بێ باوەڕن ئەڵێن ئەم قسە و باسە تۆ دەیکەیت و دەیڵێیت جادوویەکی ئاشکرا بەولاوە هیچی تر نییە).

* {الَّذِي خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ الرَّحْمَنُ فَاسْأَلْ بِهِ خَبِيرًا} (الفرقان: ٥٩)، واتە: **(ئەو خوایەی ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لەنێوانیاندایە بە شەش ڕۆژ بەدی هێنا پاشان چووە سەر عەرش و فەرمانڕەوایەتی خۆی بەو شێوەیەی کە هەر شایستەی زاتی خۆی بێت، هەر ئەوە بەبەزەیی سا تۆ داوا و هاوار هەر لەو زاتە بکە).**

* {اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ مَا لَكُمْ مِنْ دُونِهِ مِنْ وَلِيٍّ وَلَا شَفِيعٍ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ} (السجده: ٤)، واتە: (ئەو خوایە ئاسمانەکان و زەوی و هەرچیش لەنێوانیاندا هەیە لە ماوەی شەش ڕۆژدا بەدیهێنا، لە پاشان چوویە سەر عەرش، ئەی کافران بۆتان نییە هیچ دۆست و تکاکارێك -جگە لە خۆی- لەسزا ڕزگارتان بکات، دە ئایا ئامۆژگاری وەرناگرن و لەسەر کوفر و شیرکی خۆتان بەردەوام دەبن؟).

* {وَلَقَدْ خَلَقْنَا السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِنْ لُغُوبٍ } (ق: ٣٨)، واتە: (سوێند بە خوا ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لە

نێوانیاندایە لەماوەی شەش ڕۆژاندا دروستمانکرد، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ ماندووبوونێکمان تووش نەهات).

* {هُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنْزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنْتُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ} (الحديد: ٤)، واتە: **(هەر ئەو خوایە ئاسمانەکان و زەوی لە ماوەی شەش ڕۆژدا دروست کرد، پاشان چووە سەر عەرشی خۆی بە چوونێك کە شایستەی زاتی خۆی بێت، دەزانێت چی دەچێت بە ناو زەویدا لە باران و جانەوەر ...هتد، وە چیشی لێدەردەچێت لە ڕووەك و گژوگیا و میوە ...هتد، چی لە ئاسمان دێتە خوارێ و چیشی پێدا سەردەکەوێ وەك فریشتە و کاروکردەوەکان وە لەهەر جێگایەکیشدا بن ئەو (خوا)یەتان لەگەڵە، وە خوا بەهەموو کارەکانتان بینایە بە هەرشتێك تێوە ئەنجامی بدەن ئەو ئەیبینێ).**

ئەو ئایەتەی قورئان کە بە پێی ئەوە تۆ دەڵێیت کە زەوی و ئاسمان لە هەشت ڕۆژدا دروستکراوە لە سوورەتی (فصلت) ئایەتی: {قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَنْدَادًا ذَلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ (٩) وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِنْ فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِلسَّائِلِينَ (١٠) ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ (١١) فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَى فِي كُلِّ سَمَاءٍ أَمْرَهَا وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظًا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ(١٢)} (فصلت: ٩-١٢)، واتە: (پێیان بڵێ باوەڕ بەو زاتە ناکەن کە لەماوەی چوار

ڕۆژدا زەوی و تەواوی شتە نهێنییەکانی زەوی دروستکرد و هێما و وێنە و نموونە و هاوبەشی بۆ پەیداکردن و دەسەڵاتی ئەدەنە دەست، ئا ئەوە ئەو پەروەردگار و بەدیهێنەرەیە پەروەردگاری جیهانەکان، وە چەند کەژ و کێوی چەسپاوی مەحکەمی بڵندی لەسەر زەوی داناوە و کردوونی بە مێخ بۆی تا ئێوە هەڵنەدێرێ و لەسەر پشتی بژین و خێر و بێرێکی زۆری تێخست، ڕۆزی و بژێوی خەڵکەکەی تیا دیاریکرد هەر لەو چوار ڕۆژەدا، بۆ ئەوانەی کە پرسیار دەکەن زەوی لەچەند ڕۆژدا دروستکراوە؟ دەگوترێ لەو چوار ڕۆژانەدا، پاش دروستکردنی زەوی ئیرادەی دروستکردنی ئاسمانیشی کرد کە وەك دووکەڵێ وابوو، ئینجا خوا بە ئاسمان و زەویی فەرموو بێن و شکڵی خۆتان وەربگرن و ملکەچ بن چ بە زۆر چ بە ئارەزوو چونکە بڕیاردراوە کە دەبێت دروست بن، ئەوانیش وتیان وابەخۆشی ملکەچ بووین و هاتین و شکڵی خۆمانمان وەرگرت، جا حەوت ئاسمان لەماوەی دوو ڕۆژدا -جگە لە چوار ڕۆژەکەی تر- بەتەواوی دروستکرد، و لەهەر ئاسمانێك چی ئەویست بڕیاری بۆ دا کەوابوو ئاسمان و زەوی هەردوو پێکەوە لەماوەی شەش ڕۆژدا دروستکران، و نزیکترین ئاسمانیشمان بە چەندین چرا -ئەستێرە- ڕازاندەوە بۆتان و بە پاراستن پارستمان لە گوێڕاگرتنی شەیتان، ئەو کارە سەرسوڕهێنەرانە گشت ئەندازەگرتنی خوای بەدەسەڵاتی زانایە).

لەو ڕووەوە وا دەردەکەوێت کە ئەم ئایەتانەی قورئان ئاماژە بەوە دەکات کە زەوی و ئاسمان لە ماوەی هەشت ڕۆژدا دروستکراون، خوا لە سەرەتای ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت کە ئەوانەی ئەو زانیارییانەی لەم پارچە نوسینەدا هاتووە قۆرغ دەکەن یان بەکاریدەهێنن بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی گومان

سەبارەت بە دەسەڵاتی خوا کە ئارەزووی بێ ڕێزیکردن بە خوا و نەهی کردن لە یەکگرتووی دەکەن، خودا پێمان دەفەرموێت بە تێپەڕبوونی کات لە ناکاو ئەو بێ باوەڕانە ئەم دژ بەیەکییە ڕوون دەکەنەوە.

**٢- «ثم» بە مانای (وێڕای ئەمە) یان «لەمە زیاتر» دێت:**

ئەگەر بە وریاییەوە شیکاری بۆ ئەم ئایەتە بکەین ئەوا بۆت دەردەکەوێت کە سەبارەت بە دوو دروستکردن قسە دەکات؛ ئەوانیش زەوی و ئاسمان، زەوی بێجگەلە شاخەکان لە ماوەی دوو ڕۆژدا دروستکراوە، چیاکانیش لەسەر زەوی و بە چەسپاوی و نەگۆڕیی و پڕ بەرەکەت لە چوار ڕۆژدا، کەواتە زەوی لەگەڵ دروستکردنی چیاکاندا لە ماوەی شەش ڕۆژدا دروستکراوە، وێڕای ئەمە ئاسمان لە ماوەی دوو ڕۆژدا دروستکراوە، ئەو وشە عەرەبییەی کە لە سەرەتای ئایەتی (یانزەهەم)ی سوورەتی (فصلت) دا بەکارهاتووە بریتییە لە «ثم» کە بە مانای «وێڕای ئەمە» یان «دواتر» دێت.

چەند وەرگێڕێکی قورئان هەن کە «دواتر»یان بەرامبەر وشەی «ثم» بەکارهێناوە، کە «وێڕای ئەمە» دەگەیەنێت، ئەگەر «دواتر» بە هەڵە لەبەرامبەر وشەی «ثم» بەکارهێنرابێت ئەوا دروستکردنی زەوی و ئاسمان لە ماوەی هەشت ڕۆژدا دەبێت، کە ئەمەش نا چوونیەکییەك لەگەڵ ئایەتەکانی تری قورئاندا دروست دەکات؛ کە زەوی و ئاسمان لە ماوەی شەش ڕۆژدا دروستکراوە و، بەرپەرچی بیرۆکەی «تەقینەوە گەورەکە»ش دەداتەوە.

لەبەرئەوە وەرگێڕانی ڕاست بۆ وشەی «ثم» لەم ئایەتەدا «وێڕای ئەمە»یە،

عبدالله یوسف علی بە دروستی وشەی»ثم«، یان «وێـڕای ئەمە»ی وەرگێڕاوە، کە ئەوە دەردەخات زەوی و چیاکان دروستکراون لە ماوەی شەش ڕۆژو هاوکات ئاسمان لە ماوەی دوو ڕۆژدا دروستکراوە، لەبەر ئەم هۆکارە کۆی ڕۆژەکان ناکاتە هەشت ڕۆژ، بەڵکو دەکاتە شەش ڕۆژ.

ئەگەر وەستایەك بڵێت کە بینایەکی (١٠) نهۆمی و دیواری دەوروبەری لە ماوەی شەش مانگدا دروست دەکەم، لە دوای تەواو بوونی پرۆژەکەی وردەکاری زیاتر دەبەخشێت بە وتنی ئەوەی کە ژێر زەمینی بیناکە لە ماوەی دوو مانگدا و هاوکات (١٠) نهۆمەکەش چوار مانگی پێچووە و، لەو کاتەی کە ژێر زەمینی بیناکە دروست دەکرا دروستکردنی دیواری دەوروبەری دوو مانگی خایاند، کەواتە ڕوونکردنەوەی یەکەم و دووەمی دژ بەیەك نین، بەڵکو ڕوونکردنەوەی دووەمی وردەکاری زیاتر دەبەخشێت سەبارەت بە دروستکردنەکە.

## ٣- زەوی و ئاسمان هاوکات دروستکراون:

قورئان وەسفی دروستکردنی گەردوون دەکات لە چەند شوێنێکدا (پێشتر ئاماژە بە هەموو سوورەت و ئایەتەکان کراوە)، پاشان بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە خوای گەورە لە سوورەتی (الأنبياء)دا دەفەرموێت: {أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُو} (الأنبياء: ٣٠)، واتە: (ئایا خوانەناس و بێ باوەڕان نەیانبینیوە کە بێگومان ئاسمانەکان و زەوی یەکپارچە بوون و پێکەوە نووسابوون نە ئەم بارانی دەباراند نە ئەویش ڕووەکی سەوز دەکرد، جا لەوە بەدواوە ئێمە

لەیەکمان کردنەوە، لە ئاویش هەموو شتێکی زیندوومان دروست کرد، ئاخۆ هێستا هەر باوەڕ ناکەن).

خوای گەورە لەو ئایەتەی سەرەوەدا سەبارەت بە تەقینەوە گەورەکە قسە دەکات کە زەوی و ئاسمان هاوکات دروستکراون. هەروەها ئەگەر لێرەدا بە هەڵە «ثم» بە «دواتر» وەربگێڕیت؛ ئەوا تەنها لەم ئایەتە دژ بە بیرۆکەی تەقینەوە گەورەکە و ئایەتەکانی تری قورئان دەبنەوە، لەبەرئەمە وەرگێڕانی دروست بۆ وشەی «ثم» بریتییە لە «وێڕای ئەمە» یان»سەرباری ئەمە».

# پرسیاری سی و دووەم
# ئایا پیاو لە سپێرم یان تۆو دروست بووە؟

**لە شوێنێکی قورئاندا ئاماژە بەوە کراوە کە مرۆڤ لە تۆو یان سپێرم دروستکراوە و، لە شوێنێکی تریشدا ئاماژە بەوە کراوە کە لە خۆڵ دروستکراوە، ئایا ئەو دوو ئایەتە دژ بەیەک نین؟ چۆن لە ڕووی زانستییەوە دەیسەلمێنیت کە مرۆڤ لە خۆڵەوە دروست بووە؟**

## وەڵام/

**١- پیاو، یاخود مرۆڤ لە خۆڵ و سپێرمەوە دروستکراوە:**

قورئان ئاماژە بۆ دروستکردنی مرۆڤ دەکات لە دڵۆپێك سپێرمەوە؛ لە چەند ئایەتێکدا لەوانە: {أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِنْ مَنِيٍّ يُمْنَى} (القيامة: ٣٧)، واتە: (ئاخۆ ئەوە نوتفە و ئاوێکی کەم نەبوو لە مەنی پیاودا دەڕێژرایە ناو منداڵدانەوە؟ بۆچی وا زوو گۆڕا؟) هەروەها قورئان لە چەند شوێنێکی تر ئاماژە بەوە دەکات کە مرۆڤ لە خۆڵ دروستکراوە، ئەم ئایەتەی خوارەوە وەکو سەرچاوەیەك بەکاردێت: {يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِنْ مُضْغَةٍ مُخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِنُبَيِّنَ لَكُمْ وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ وَمِنْكُمْ مَنْ يُتَوَفَّى وَمِنْكُمْ مَنْ يُرَدُّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِنْ بَعْدِ عِلْمٍ شَيْئًا وَتَرَى الْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنْزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنْبَتَتْ مِنْ كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ} (الحج: ٥)، واتە: (ئەی خەڵکینە! ئەگەر ئێوە لە

زیندووبوونەوە دوو دڵ و بەگومانن، وەرن تەماشایەکی سەرەتا و بنەڕەتی خۆتان بکەن و چاکیش بزانن ئێمە ئادەممان لە گڵ درووستکردووە، لە پاشا (نەوەکانی) لە تنۆکە ئاوێك کە لە پشتی باوك هەڵدەقوڵێ، ئینجا لە خوێنپارەیەك وەك زەروو، پاشان لە گۆشتپارەیەك، تەواو سەر و سیما پێدراو یا ناتەواو، پێش تەواوبوون لەباردەچێ، تا دەسەڵاتی خۆمانتان بۆ دەربخەین، ئینجا چیمان بوێ بۆی دەیخەینە منداڵدانەوە و هەر لەوێش بڕیاری لەسەر دەدەین و دەیهێڵینەوە تا دیمەن و نیگاری تەواو دەبێت تا کاتی دیاریکراو بۆ لەدایکبوونی ڕادەگەیەنین، پاشان بەساوایی و زۆر لاواز و بێ دەسەڵات لەو منداڵدانەدا دەتان هێنینە خوارێ، پاشان پەروەردەتان دەکەین تا وردە وردە دەگەنە هێز و پێزی تەواوتان و بیروهۆشتان کامڵ دەبێت، هەتانە هەر لەسەرەتای ژیانەوە دەمرن و ئەوەندە نامێننەوە، هی واشتان هەیە دەمێنێ و تەمەنی درێژ دەبێت، تاوای لێدێت پاش ئەوەی کاتی خۆی شتێکی دەزانی ئێستا هەموو شتێکی لەبیردەچێتەوە، بەڵگەیەکی تری دەسەڵاتمان بۆ زیندووکردنەوەتان لەوەرزی زستاندا ئەم زەویە وشك و مردووەیە دەبینی کە هیچ گژوگیایەکی تیا نییە و خامۆش و بێ هەست و خوست، کەچی هەر کە ئاوی بارانی بەسەردا دەبارێت ڕادەچەنێ و دەبزوێ و بە جووڵە دەکەوێ و ئەژیەتەوە بەخۆدا دێت و گەشە دەکا و لە هەموو جۆرە گژوگیایەکی جوان دەڕوێ).

ئێستا ئێمە دەزانین کە هەموو توخمەکانی جەستەی مرۆڤ لە زەویدا بوونیان هەیە چ بە بڕێکی کەم بێت یان زۆر، ئەمە ڕاڤەیەکی زانستییە بۆ ئایەتی قورئانی کە دەفەرموێت پیاو لە خۆڵەوە دروست بووە، لە چەند

ئایەتێکی دیاریکراودا قورئان ئاماژە بەوە دەکات کە پیاو لە سپێرمەوە دروستکراوە، لە کاتێکدا لە چەند ئایەتێکی دیاریکراوی تردا قورئان ئاماژە بەوە دەکات کە پیاو لە خۆڵەوە دروستکراوە هەرچەندە دژیەکبوون نییە، دژ بەیەکبوون بە مانای ئەوە دێت کە دەربڕینەکان دژ بەیەك بن و ململانێی یەکتر بکەن و پێکەوە لەهەمان کاتدا ڕاست نەبن.

## ٢- پیاو لە ئاو دروستکراوە:

لە چەند شوێنێکی دیاریکراوی قورئاندا هاتووە کە پیاو لە ئاوەوە دروستکراوە: {وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ مِنَ الْمَاءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُ نَسَبًا وَصِهْرًا وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا} (الفرقان: ٥٤)، واتە: (خوا هەر ئەو زاتەیە کە لە تنۆکە ئاوێ (مەنی) مرۆیەکی ژیر و بیسندە و گۆیا و بینای دروست کردووە)، زانست ئەوەی سەلماندووە کە هەر سێ دەربڕینەکە ڕاستن، پیاو لە سپێرم و خۆڵ و ئاوەوە دروستکراوە.

٣- ئەوە دژ بەیەکبوون نییە، بەڵکو وادابنێ کە من دەڵێم بۆ ئەوەی کوپێك چا دروست بکەین پێویستمان بە ئاوە، هەروەها بە گەڵای چا بۆ دەستکەوتنی چا، هەردوو ڕستەکە یان دەربڕینەکە دژ بەیەك نین، چونکە پێویستمان بە ئاو و گەڵای چایەکەیە بۆ ئەوەی چایەك دروست بکەین، زیاتر ئەگەر من بمەوێت چایەکی شیرین دروست بکەم ئەوا پێویستە شەکریشی بۆ زیاد بکەین.

هەرچەندە لە قورئاندا هیچ دژ بەیەکێك بوونی نییە کاتێك دەفەرموێت

پیاو له سپێرم و خۆڵ و ئاو دروستکراوە، ئەوە دژبەیەکبوون نییە، بەڵکو جیاکارییە لە جیاوازبووندا کە بە مانای قسەکردن دێت لەنێوان دوو چەمکی جیاوازدا لەسەر هەمان بابەت بە بێ ململانێ، بۆ نموونە ئەگەر من بڵێم پیاو هەمیشە ڕاستگۆ و درۆزنە ئەوە دژبەیەکبوونە، بەڵام ئەگەر بڵێم پیاو هەمیشە دڵسۆز و میهرەبان و خۆشەویستییان هەیە ئەوا جیاکارییە لە جیاوازبووندا.

# پرسیاری سی و سێیەم
# خوا خوای دوو ڕۆژهەڵات و دوو ڕۆژئاوایە؟

**لە ئایەتێکدا ئاماژە بەوە کراوە کە خوا خوای دوو ڕۆژهەڵات و دوو ڕۆژئاوایە، چۆن لە ڕووی زانستییەوە شرۆڤەی ئەم ئایەتە دەکەیت؟**

## وەڵام/

**١- قورئان ئاماژە بەوە دەکات کە» خوا» خوای دوو ڕۆژهەڵات و دوو ڕۆژئاوایە.**

ئەو ئایەتەی قورئان ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە خوا دەسەڵاتدار و خوای دوو ڕۆژهەڵات و دوو ڕۆژئاوایە، لەم ئایەتەی سوورەتی (الرحمن): {رَبُّ الْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ الْمَغْرِبَيْنِ} (الرحمن: ١٧)، واتە: (هەر ئەو خوایە خاوەنی دوو هەڵاتگەی خۆرە لە هاوین و زستاندا وە هەروەها خاوەنی دوو جێگاری خۆرئاوابوونی خۆرە لە هاوین و زستاندا)، لە قورئاندا ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بە شێوازی دوانی بەکارهاتووە ئەوە بە مانای ئەوە دێت کە «خوا» خوای دوو ڕۆژهەڵات و دوو ڕۆژئاوایە.

**٢- خوا دەسەڵاتدار و خوای هەردوو ڕۆژهەڵات و ڕۆئاوایە:**

زانستی جوگرافیا ئەوەمان پێ دەڵێت کە خۆر لە خۆرهەڵاتەوە هەڵدێت، بەڵام ئەو خاڵەی کە خۆر بەردەوام دەکات لە گۆڕین بەدرێژایی ساڵ

تەنها لە دوو ڕۆژی ساڵدا دەبێت کە بە « یەکسانی نیوەی شەو و ڕۆژ» ناسراوە، ئایا خۆر بە دروستی لە خۆرهەڵاتەوە هەڵدێت؟ لەچەند ڕۆژی دواتردا تەنانەت لەلایەکی کەمی باشور و لایەکی کەمی باکورەوە بە لای ڕۆژهەڵاتدا هەڵدێت، لە ماوەی وەرزگۆڕینی هاویندا خۆر لە ئەوپەڕی ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدێت، وە لەماوەی وەرزگۆڕینی زستاندا خۆر لەم پەڕی خۆرهەڵاتەوە هەڵدێت، بە هەمان شێوە لەماوەی وەرز گۆڕینی هاویندا خۆر لەم پەڕی خۆرئاوابوونەوە ئاوا دەبێت و، لەکاتی وەرزگۆڕینی زستاندا خۆر لەوپەڕی خۆرئاوابوونەوە ئاوا دەبێت، دەتوانرێت ئەم دیاردە بەئاسانی لە بۆمبای ببینرێت، یان لە هەر شارێکی تر لەلایەن ئەو خەڵکەی کە لەو ناوچە دیاریکراوانەدا دەژین، ئەوان دەتوانن تێبینی ئەوە بکەن کە لە ماوەی وەرزگۆڕینی هاویندا خۆر لەم پەڕی خۆرهەڵاتەوەە هەڵدێت و، لە ماوەی وەرزگۆڕینی زستاندا لەو پەڕی خۆرهەڵاتەوە هەڵدێت، بەکورتی بە درێژایی ساڵ خۆر بەردەوام دەبێت لە هەڵهاتن لە چەند خاڵێکی جیاوازی خۆرهەڵات و، ئاوا دەبێت لە چەند خاڵێکی جیاوازی خۆرئاوابوونەوە، بەوشێوەیە کاتێك قورئان ئاماژە بەوە دەکات کە «خوا» دەسەڵاتدار و خوای دوو ڕۆژهەڵات و دوو ڕۆژئاوایە، یان بە مانایەکی تر خوای هەردوو پەڕی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایە.

## ٣- «خـوا»ی دەسـەڵاتـدار و خـوای هەموو خاڵەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایە:

زمانی عەرەبی دووجۆر کۆی هەیە یەکێکیان «کۆ»ی دوانییە؛ کە ئاماژە بۆ دوو شت دەکات، جۆرەکەی تریان «کۆ»ی ئاماژە بۆ دوو یان زیاتر، لەو

ئایەتەی سوورەتی (الرحمن) کە پێشتر باسمانکرد ئەو وشە عەرەبییانەی بەکارهاتووە بریتین لە: «المشرقين» و «المغربين» کە کۆی دوان بێت، واتە دوو ڕۆژهەڵات و دوو ڕۆژئاوا.

خوای گەورە لەم ئایەتەی قورئاندا دەفەرموێت: {فَلَا أُقْسِمُ بِرَبِّ الْمَشَارِقِ وَالْمَغَارِبِ إِنَّا لَقَادِرُونَ} (المعارج: ٤٠)، واتە: (جا سوێند بە خاوەنی خۆرهەڵاتەکان و خۆرئاواکان ئێمە بە توانا و دەسەڵاتین).
ئەو وشە عەرەبییانەی کە لەم ئایەتەدا بۆ ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بەکارهاتوون بریتین لە: «مشرقی» و «مغربی» کە لە جۆری دووەمی کۆیە، کە ئاماژە بۆ دوو و زیاتر لە دووە، لەبەرئەوە لە دەرئەنجامدا «خوا» خوای هەموو خاڵەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایە.

# پرسیاری سی و چوارەم

## یەک ڕۆژ لە دیدی خوادا بریتییە لە (١٠٠٠ بۆ ٥٠٠٠٠ ساڵ)

**ئایەتێک هەیە لە قورئاندا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە یەک ڕۆژ لە دیدی خوادا یەکسانە بە (١٠٠٠ ساڵ)، وە لە ئایەتێکی تری قورئاندا هاتووە کە یەک ڕۆژ یەکسانە بە (٥٠٠٠٠ ساڵ)، ئایا قورئان خۆی دژایەتی خۆی ناکات؟**

## وەڵام/

**١- کات لەلای خوا بەراورد ناکرێت بە کاتی لەسەر زەوی:**

خوای گەورە لە دوو شوێنی قورئاندا دەفەرموێت: {وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَلَنْ يُخْلِفَ اللَّهُ وَعْدَهُ وَإِنَّ يَوْمًا عِنْدَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ} (الحج: ٤٧)، واتە: (لە جیاتی ئەوەی وردبنەوە لە شوێنەواری تیاچووەکان! کەچی بەگاڵتەوە بەپەلە داوای سزات لێ ئەکەن خۆ هەر پێش دێت، بەڵام هەموو شتێك بەلای خواوە کاتێکی بۆ بڕاوەتەوە خواش هەرگیز لە بەڵێنی خۆی پێچەوانە کار ناکات، خوا زۆر لەسەرخۆ کار ئەکات، چونکە تاکە ڕۆژێ لەلای پەروەردگارت بەقەد (هەزار ساڵ)ە کە ئێوە دەیژمێرن).

{يُدَبِّرُ الْأَمْرَ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ أَلْفَ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ} (السجدة: ٥)، واتە: (ئەو خوایەیە کە لە سەرووی ئاسمانەوە بۆ زەوی کاروباری خەڵك دەبر دەکات، لە پاشان بەرز ئەبنەوە بۆ لای خۆی، لە ڕۆژێکدا کە بەپێی ژماردنی ئێوە (یەك هەزار ساڵە)، کە پێوانەی یەك ڕۆژ لە دیدی خوادا یەکسانە بە (١٠٠٠ ساڵ) و، لە ئایەتێکی تر هاتووە کە یەك ڕۆژ یەکسانە بە (٥٠٠٠٠ ساڵ)، بەبەراورد بە ساڵی سەر زەوی، ئەم ئایەتانە بە گشتی بە مانای ئەوە دێت کە کات لەلای خوا بەراورد ناکرێت بە کات لەسەر زەوی.

### ٢- «یوم» بە مانای مانەوە دێت:

«یوم» کە لەم ئایەتەدا ئاماژەی بۆ کراوە کە هاوتای ئەوەی کە مانای ڕۆژ دێت مانای «ماوەیەکی درێژ» یان «چەرخ»ێك دەگەیەنێت، گەر وشەی «یوم» بە دروستی وەربگریت بە «ماوە» ئەوا هیچ ئاڵۆزبوونێك نییە.

### یەکەم: (الحج: ٤٧) (پێشتر ئاماژە بەم ئایەتەکراوە):

کاتێك ئافرەتان داوایان کرد کە پەلە بکات لە سزادانەکە، خوای گەورە لە قورئاندا فەرمووی خودا لە بەڵێنەکانی پاشگەز نابێتەوە، لە ڕاستیدا ماوەیەك لە دیدی خوادا وەکو (١٠٠٠ ساڵ)ی سەر زەوی وایە.

**دووەم: (السجدە: ٥) (پێشتر ئاماژە بەم ئایەتەکراوە):**

**سێیەم:** {تَعْرُجُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ} (المعارج: ٤)، واتە: (فریشتەکان و جوبریل بەرزدەبنەوە بۆ لای لە ڕۆژکارێکدا کە ماوەکەی (پەنجا هەزار ساڵ)ە لای موشریك و و بێ باوەڕەکان).

**چوارەم:** ماوەی دوو کاری جیاواز پێویستە هاوتا بێت، بۆ نموونە ئەو ماوەیەی کە پێویستە بۆ سەفەرکردن لە خاڵی«A» بۆ ڤاشی یەك کاتژمێر ،و ئەو ماوەیەی کە پێویستە بۆ سەفەرکردن لە خاڵی«B» بۆ کشمیر (٥٠) کاتژمێر بێت، ئەوە ئەوە ناگەیەنێت کە من دوو دەربڕینی دژبەیەکم دەربڕیوە، لەبەر ئەم ئایەتەی قورئان نەك تەنها دژایەتی یەك ناکەن، بەڵکو لە ئاستێکی گونجاوی ئەوەدان لەگەڵ ڕاستییەکانی زانستی سەردەم.

# پرسیاری سی و پێنجەم
# ئیبلیس مرۆڤ بووە یان جن؟

**لە چەند شوێنێکی قورئاندا ئەوە هاتووە کە ئیبلیس فریشتەیە، بەڵام لە سوورەتی (الكهف)دا ئاماژە بەوە کراوە کە ئیبلیس جن بووە، ئەمە دژ بەیەک نییە لە نێوان ئایەتەکانی قورئاندا؟**

## وەڵام/

**١- ڕووداوی ئیبلیس و فریشتەکان لە قورئاندا باسکراوە:**

چیرۆکی ئادەم و ئیبلیس لە زۆر شوێنی قورئاندا باسکراوە لەوانە:

* {ثُمَّ لَآتِيَنَّهُمْ مِنْ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَانِهِمْ وَعَنْ شَمَائِلِهِمْ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَاكِرِينَ} (الأعراف: ١٧)، واتە: (ئەوساش لەبەردەم و لەدوایانەوە لەڕاست و لە چەپیانەوە بۆیان بێم و بچمە جەستەیانەوە، دونیا و قیامەتیان لێ چەواشە بکەم، ئەو کات دەبینی کە زۆربەیان سوپاسگوزار و یەکتاپەرست نابن).

* {وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِنْ صَلْصَالٍ مِنْ حَمَإٍ مَسْنُونٍ (٢٨) فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ (٢٩) فَسَجَدَ الْمَلَائِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ (٣٠) إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَى أَنْ يَكُونَ مَعَ السَّاجِدِينَ (٣١)} (الحجر: ٢٨-٣١)، واتە: (وەبیر بێنە ئەو کاتە پەروەردگارت بە فریشتەکانی ووت،

كە مرۆڤێك دروست دەكەم لە قوڕێكی ڕەشی گۆڕاوی وشكهەڵاتووی وا كە هەركات پەنجەی لێ درابا دەنگی دەدایەوە، ئینجا هەر بەتەواوی ڕێكمخست و لە گیانی خۆم روحم بەبەردا كردووە بوو بە مرۆڤێكی تەواو خاوەن گیان، ئێوەش فریشتەكان دا وەرنەوە و دەمە و ڕوو سووژدەی بۆ بەرن هەمووتان، ئینجا فریشتە دەست بەجێ هەموویان بەتێكڕا فەرمانەكەی خوایان بەجێ هێنا و كڕنووشی ڕێز و حورمەتیان بۆ ئادەم برد، شەیتانی گەورە -ئیبلیس- نەبێ، ئەو ملی نەداو، ئیبایكرد لەگەڵ كڕنوشبەران بێت).

* {وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ قَالَ أَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا} (الإسراء: ٦١)، واتە: (ئەو كاتەیان وەبیر بێنەوە ئەی پەیامبەر كە بە فریشتەكانمان گوت كڕنوش بەرن، كڕنوشی ڕێز و حورمەت، جا ئەوانیش دەست بەجێ كڕنوشیان برد ئیبلیس نەبێ، وتی من چۆن كڕنوش دەبەمە بەر كەسێك كە لە قوڕ دروستكراوە؟

* {وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَى} (طه: ١١٦)، واتە: (بە فریشتەكانمان ووت: كڕنوش بۆ ئادەم بەرن، ئەوانیش هەموو بەپەلە سوژدەیان بۆ برد ئیبلیسی (شەیتان) نەبێت، ئەو فیزی نەهێنا و سوژدەی نەبرد).

* {إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِنْ طِينٍ (٧١) فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ (٧٢) فَسَجَدَ الْمَلَائِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ

(٧٣) إِلَّا إِبْلِيسَ اسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ (٧٤)} (ص: ٧١-٧٤)، وات:ە (ئەو دەمەی کە پەروەردگاری تۆ بە فریشتەکانی فەرموو: وا لە قوڕ بەشەرێك واتە ئادەم دروست دەکەم، ئینجا کاتێ لەشیم رێکوپێك کرد و لە ڕوحی خۆم گیانم کرد بەبەردا، ئێوەش هەمووتان سوجدە و کڕنوشی ڕێزی بۆ بەرن، ئەوسا فریشتەکانیش گشتیان سوجدە و کڕنوشیان بۆ برد مەگەر ئیبلیسی شەیتان نەبێ کە خۆی لێگۆڕا و دەعیەچی و دەمبازبوو، سپڵەیی کرد).

بەڵام لە سوورەتی (الکهف)دا دەفەرموێت: {وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ الْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ أَفَتَتَّخِذُونَهُ وَذُرِّيَّتَهُ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِي وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّ بِئْسَ لِلظَّالِمِينَ بَدَلًا} (الکهف: ٥٠)، واتە: (ئەو ڕۆژگارە وەبیر بێنە کە بە فریشتەکانمان ووت: سوژدە بۆ ئادەم بەرن، دیارە مەبەست لەو سوژدەیە سوژدە و کڕنوشی ڕێزە نەك سوژدەی پەرستن، ئەوانیش هەموو دەستبەجێ فەرمانەکەیان جێبەجێکرد و کڕنوشیان برد (ئیبلیس) نەبێ، ئەو لە (جن) بوو لە فەرمانی پەروەردگاری خۆی دەرچوو، ئایا ئیتر ئێوە شەیتان و زارۆ و نەوەکانی لەباتی من (خوا) دەکەنە دۆست و پشتیوانی خۆتان؟ لە حاڵێکدا کە ئەوان (خۆی و نەوەکانی) دوژمنی ئێوەن و هەمیشە دژایەتیتان دەکەن، ئای چ گۆڕینەوەیەکی خراپە گوێڕایەڵی کردنی ناهەقیکاران بۆ شەیتان لەباتی خوا).

## ٢- یاسای عەرەبی «تغلیب»:

وەرگێڕانی بەشی یەکەمی ئایەتەکە بریتییە لە» ئێمە بە فریشتەکانمان

ووت سوجده ببەن بۆ ئادەم، ئەوان سوجدەیان برد بێجگە لە ئیبلیس» ئەمە ئەوەمان لا دروست دەکات کە ئیبلیس فریشتە بووە، قورئان بە عەرەبی دابەزیوە، لە ڕێزمانی عەرەبیدا یاسایەك هەیە کە بە «تغلیب» ناسراوە، ئەگەر زۆرینە بانگکران ئەوا کەمینەش دەگرێتەوە، بۆ نموونە ئەگەر لە پۆلێکدا (٩٩) خوێندکاری کوڕ و تەنها (١) خوێندکاری کچ هەبوو ئەوا ئەگەر بە عەرەبی بڵێم با کوڕەکان هەستن ئەوا کچەکەش دەگرێتەوە، پێویست ناکات بە تەنها ناوی بهێنرێت.

هاوشێوەی ئەو نموونەیەی سەرەوە لە قورئاندا کاتێك خوا بانگی فریشتەکانی کرد ئیبلیسیش ئامادە بوو، بەڵام پێویست ناکات بە تەنها ناوی بهێنرێت. کەواتە بە گوێرەی ئەو ڕستەیە ئیبلیس ڕەنگە فریشتە و ڕەنگە جنیش بێت، بەڵام لە سوورەتی (الکهف) ئایەتی (١٨) ئەوە دەزانین کە ئیبلیس جن بووە، لە هیچ شوێنێکی قورئاندا نەهاتووە کە بڵێن ئیبلیس فریشتە بووە، کەواتە هیچ دژ بەیەکبوونێك لە قورئاندا بوونی نییە.

٣- جن ئازادە و دەتوانێت گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا نەبێت، جن ئازادە و ڕەنگە بێ گوێی فەرمانەکانی خواش بکات، بەڵام فریشتە هەمیشە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوایە کەواتە لە فەرمان دەرچوونی ئیبلیس و گوێنەدان بە فەرمانەکانی خوا ئەوە دەردەخات کە ئیبلیس جنە نەك فریشتە.

# پرسیاری سی و شەشەم

## دانەری قورئان شارەزایی زانستی بیرکاری نییە

**بە گوێرەی ئارون شوری هەڵەی بیرکاری هەیە لە قورئاندا لە سوورەتی (النساء ) ئایەتی (١١ و ١٢) کاتێک کە بەشە جیاوازەکانی میرات کە دەدرێت بە میراتگرەکان کۆی دەکەینەوە زیاترە لەیەک، کەوابێت دانـەری قورئان بیرکاریزان نییە.**

## وەڵام/

**قورئان لە چەندین شوێندا سەبارەت بە میرات قسەی کردووە:**

* سوورەتی (البقرة) (٢:١٨٠) (ئەم ئایەتە لە بابەتی (میرات)دا باس و ڕاڤەکراوە)

* سوورەتی (البقرة) (٢:٢٤٠) (ئەم ئایەتە لە بابەتی (میرات)دا باس و ڕاڤەکراوە).

* سوورەتی (النساء) (٤: ٧-٩) (ئەم ئایەتە لە بابەتی (میرات)دا باس و ڕاڤەکراوە).

* سوورەتی (النساء) (٤: ١٩) (ئەم ئایەتە لە بابەتی (میرات)دا باس و ڕاڤەکراوە).

* سوورەتی (النساء) (٤: ١٩) (ئەم ئایەتە لە بابەتی (میرات)دا باس و ڕاڤەکراوە).

* سوورەتی (النساء) (٤: ٣٣) (ئەم ئایەتە لە بابەتی (میرات)دا باس و ڕاڤەکراوە).

* سوورەتی ( المائدة) (٥: ١٠٥-١٠٨) (ئەم ئایەتە لە بابەتی (میرات)دا باس و ڕاڤە کراوە).

* سوورەتی (النساء) (١١ و ١٢و ١٧٦) زۆر بە وردی باسی میراتی کردووە. (ئەم ئایەتە لە بابەتی (میرات)دا باس و ڕاڤەکراوە).

ئێستا با هەڵسەنگاندنێك بۆ ئەو ئایەتە بکەین کە لەلایەن (ئارون شوری)یەوە باسکراوە. (١١/٤ و ١٢) (پێشتر لە بابەتی میراتدا ئەم ئایەتە تەفسیرکراوە).

ئاینی ئیسلام بە وردەکارییەکی زۆرەوە یاسای میراتی باسکردووە، تەواوی بنەما و بنچینەکانی لە قورئاندا ئاماژەی بۆ کراوە، لەوەش زیاتر وردەکاری زیاتر لە فەرموودەکاندا باسکراوە. کەسێك دەتوانێت هەموو ژیانی بەسەرببات بە گەڕانی بە دوای یاسای ئیسلامی سەبارەت بە میرات لە هەموو ڕوویەکەوە، (ئارون شوری) پێشبینی دەکات کە تەنها بە ڕووکەش

ئەویش بە تەنها بە خوێندنەوەی دوو ئایەت لە قورئان بە بێ زانینی بنچینەکان.

ئەمە هاوشێوەی ئەو کەسەیە کە دەیەوێت هاوکێشەیەکی بیرکاری شیکار بکات، بەڵام یاسا بنچینەییەکانی بیرکاری نازانێت، بێ ئاگا لەوەی کە کام هێمای بیرکاری لە سەرەتادا دێت، کام هاوکێشە دەبێت سەرەتا شیکار بکرێت، لە زانستی بیرکاریدا یەکەم کەوانەکان دووەم دابەشکردن و سێیەم لێکدان و چوارەم کۆکردنەوە و پێنجەم لێدەرکردن، گەر (ئارون شۆری) بیرکاری نەزانێت و، سەرەتا لێکدان و دواتر لێدەرکردن و دواتر کەوانەکان و دواتر دابەشکردن و لە کۆتاییدا کۆکردنەوە ئەنجام بدات؛ ئەوا وەڵامەکە ژمارەیەکی زۆر هەڵەی تێدا دەبێت.

کاتێك قورئان ئاماژە بۆ یاسای میرات دەکات لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (١١ و ١٢)، سەرەتا میراتگرەکان و دواتر دایك و باوك و هاوسەر، بە گوێرەی یاسای میرات لە ئیسلامدا دوای دانەوەی ئەو پارەیەی لەسەریانە لە سەرەتادا، ئەو بەشەی کە دەدرێت بە هاوسەر بە پشت بەستن بەوەی کە ئایا کەسی مردوو منداڵی بەجێ هێشتووە یاخود نا، هەرچەندە سامان کە جێهێڵرابێت دەکرێت بە دوو بەشەوە لەنێوان کوڕەکان و کچەکان بە ڕەچاوکردنی بەشەکان، کەواتە ئەو پرسیارە لە کوێوە سەری هەڵدا کە دەرئەنجامی کۆتایی دەکاتە یەك؟ کەواتە ئەوە خوا نییە کە سەبارەت بە بیرکاری نازانێت، بەڵکو ئەوە (ئارون شوری) خۆیەتی کە بیرکاری پشتگوێ خستووە.

# پرسیاری سی و حەوتەم
# خوا بەخشندەیە یان تۆڵەسێنە؟

**قـورئـان لە چەند شوێنێکدا فەرمویەتی کە خوا میهرەبانترین و بەخشندەترینە، بەڵام لە زۆر شوێندا ئاماژە بە سزای توند دەکات، ئایا خوا بەخشندەیە یان تۆڵەسێنە؟**

## وەڵام/

### ١- خوا میهرەبانترینە:

قورئان لە چەندین شوێن دەفەرموێت کە خوا میهرەبانترینە، لە ڕاستیدا هەموو (١١٤) سوورەتەکەی قورئان بێجگەلە لە سوورەتی (التوبة) بە: **«بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ»** دەست پێدەکات؛ بە مانای «بە ناوی خوای گەورە و میهرەبان».

### ٢- خوا بەخشندەیە:

لە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆزدا باس لە بەخشندەیی خوای گەورە کراوە لەوانە (النساء : ٢٥) و (المائدة: ٧٤)، کە ئاماژە بەوە دەکەن کە «خوا زۆر لێبوردە و زۆر میهرەبانە».

## ٣- خودا سزای توندی ئەو کەسانە دەدات کە شایەنیانە:

خودا لەگەڵ ئەوەی بەخشندە و میهرەبانە سزای زۆر توند دەسەپێنێت بەسەر ئەو کەسانەی کە شایستەی ئەو سزا توندەن، لە چەند ئایەتێکی قورئاندا هاتووە کە خوا سزای هەموو ئەو کەسانە دەدات کە لە فەرمانی دەردەچن، چەند ئایەتێك باس لە چەند جۆرێکی جیاوازی ئەو سزا توندە دەکەن کە خوا بەسەر سەرپێچیکاراندا دەیسەپێنێت: {إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآَيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا} (النساء : ٥٦)، واتە: (بێگومان ئەوانەی بە ئایەت و نیشانەکانی ئێمە بێ باوەڕن، لە دوا ڕۆژدا دەیانبەینە ناو ئاگرێکی بڵێسەدار و گەرمەوە ئەیانبرژێنێ هەرجارەی کە پێستی جەستەیان داپڵۆخا و سووتا چەند پێستێکی تریان بۆ ئەگۆڕین لەجێی ئەوەدا، تا پتر ئەو سزایە بچێژن، بەڕاستی خوا دەسەڵاتداری کار دروستە هەرگیز لە خۆیەوە سزای کەس نادات).

## ٤- خوا دادپەروەرە:

پرسیارەکە ئەوەیە خوا بەخشندەیە یان تۆڵەسێنە؟ خاڵێکی گرنگ کە دەبێت ڕەچاو بکرێت ئەوەیە کە لەگەڵ ئەوەی کە خوا بەخشندە و میهرەبانە، سزای توندی ئەو کەسانەش دەدات کە خراپە دەکەن، چونکە ئەو دادپەروەرە، قورئان لە سوورەتی (النساء)دا ئاماژەی پێکردووە: {إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِنْ تَكُ حَسَنَةً يُضَاعِفْهَا وَيُؤْتِ مِنْ لَدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا} (النساء: ٤٠)، واتە: (بێگومان خوا بەسەنگی بچوکترین گەردیلە (زەررە) ستەم لە هیچ کەس ناکا و بە ئەندازەی گەردیلەیەك چاکە بوو،

خوا بەرەکەتی بەسەردا دەڕێژێ و دوو ئەوەندە پاداشتی ئەداتەوە و لای خۆی پاداشتێکی گەورەی پێدەبەخشێ)، زیاتر و وردتر خوای گەورە لە سوورەتی (الأنبياء)دا دەفەرموێت: {وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِنْ كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ} (الأنبياء: ٤٧)، واتە: (بێگومان رۆژی قیامەت ئێمە تەرازووی بەرامبەر دادپەروەریی دائەنێین و کردەوەکانیانی پێ ئەکێشین، ئەوسا هیچ کەسێك کەمترین ستەمی لێناکرێ چ لە چاکەکاران و چ لە خراپەکاران، تەنانەت ئەگەر کردەوەکانیان بەئەندازەی سەنگی دەنکە خەرتەلەیەکیش بێت کە لە بچوکیدا کراوە بەنموونە ئێمە ئەیهێنین و ئامادەی ئەکەین وە ئەوەندە بەسە بۆ ئێمە کە بە وردی ژمێریاری کردەوەکانیان بین).

## ٥- نموونە: مامۆستا ئەو خوێندکارە دەبەخشێت کە گزی دەکات لە کاتی تاقیکردنەوەدا:

ئەگەر لەکاتی تاقیکردنەوە خوێندکارێك گزی بکات و ئەو مامۆستایەش کە چاودێرە بەسەریەوە بە گزیکردنی خوێندکارەکە دەزانێت، مامۆستاکە دەڵێت کە ئەو زۆر بەخشندە و میهرەبانە؛ بۆیە ڕێگەدەدا بە خوێندکارەکە بەردەوام بێت لە گزیکردنەکەی، ئەو خوێندکارانەی کە زۆر هەوڵیان داوە وە کۆششیان کردووە بۆ تاقیکردنەوەکە بە مامۆستاکە ناڵێن بەخشندە و میهرەبانە، بەڵکو پێی دەڵێن نادادپەروەرە، ئەم کردارە بەبەزەییەی مامۆستاکە هانی خوێندکارەکانی تر دەدات ئەوانیش گزی بکەن.

ئەگەر هەموو مامۆستاکان میهرەبان و بەبەزەیی بن و ڕێگە بدەن کە خوێندەکارەکان گزی بکەن؛ ئەوا هەرگیز خوێندکار بۆ تاقیکردنەوەکان

هەوڵ نادات و خۆی بۆ ئامادە ناکات و، لە ئەنجامیشدا لە ڕێی گزی کردنەوە نمرەیەکی زۆر باشیش بەدەستدەهێنێت، بەو جۆرەش هەموو خوێندکارەکان لە تاقیکردنەوەکاندا دەردەچن، بەڵام لە ڕووی کردارییەوە لە ژیانیان شکستدەهێنن، تەواوی مەبەستی تاقیکردنەوە هەڵدەوەشێت و هیچ بەهایەکی نامێنێت.

## ٦- ژیان تاقیکردنەوەیە بۆ ژیانی دوای مردن:

ژیان لەم جیهانەدا تاقیکردنەوەیە بۆ ژیانی دوای مـردن، قورئان لە سوورەتی «الملك»دا دەفەرموێت: {الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ} (الملك: ٢)، واتە: (ئەو خوایە کە مردن و ژیانی دروستکرد، بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە، کامەتان کار و کردەوەی چاکتر و باشترە پاشانیش بەپێی ئەوە پاداشت وەردەگرێتەوە وە تەنها ئەو دەسەڵاتدار و زۆریش گونە پۆش و لێبوردەیە).

## ٧- ئەگەر هەمووان ببەخشێت و کەس سزا نەدات کێ فەرمانەکانی خوا جێبەجێ دەکات؟

ئەگەر خوا هەموو کەسێك ببەخشێت و کەس لەسەر تاوانەکانی سزا نەدات؛ ئەوا ئەو کات بۆچی خەڵك پێویستە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا بێت؟ من هاوڕام لەگەڵ ئەوەی کە کەس نەچێتە جەهەننەمەوە، بەڵام ئەم ژیانەی ئێستامان دەبێتە جەهەننەم، ئەگەر هەموو مرۆڤەکان بچن بۆ بەهەشت؛ کەواتە مەبەست و ئامانج و سوودی مرۆڤەکان چییە؟ کاتێك دێتە دونیاوە و، ئەم ژیانە ناتوانرێت ناوی لێ بنرێت تاقیکردنەوە بۆ ژیانی

دوای مردن.

٨- خوا تەنها لەو کەسانە خۆش دەبێت کە تەوبە دەکەن، خوای گەورە تەنها ئەو کەسانە دەبەخشێت کە پەشیمان دەبنەوە و تەوبە دەکەن: {قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ (٥٣) وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنْصَرُونَ (٥٤) وَاتَّبِعُوا أَحْسَنَ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ مِنْ رَبِّكُمْ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنْتُمْ لَا تَشْعُرُونَ (٥٥)} (الزمر: ٥٣-٥٥)، واتە: (ئەی موحەمەد لە منەوە بڵێ: ئەی بەندەکانی من ئەی ئەوانەی ستەم و زیادەڕۆییان لە خۆتان کردووە، ئێوە لە میهرەبانی خوا بێ ئومێد مەبن، بەڕاستی خوا لە هەموو کوناهێ خۆش ئەبێ، چونکە ئەو لێبوردە و میهرەبانە، بگەڕێنەوە بۆ لای خواوەندتان و ملکەچی فەرمانی ئەو بن پێش ئەوەی سزاکەتان بۆ بێ، دواییش لەلایەن هیچ کەسێکەوە یارمەتی نادرێن).

## چوار بنچینەی تەوبە کردن هەیە:

**یەکەم:** ڕازی ببە بەوەی کە کارەکە هەڵەیە.

**دووەم:** کتوپڕ لە ئەنجامدانی ئەو کارە بوەستە.

**سێیەم:** لە داهاتوودا هەرگیز دووبارەی مەکەرەوە.

**چوارەم:** هەموو ئەو زیانانە بژمێرە کە داوتە لە هەر کەسێك.

# پرسیاری سی و هەشتەم

## بت بەکاردەهێنرێت بۆ جەختکردنەوە (ترکیز)

**توێژەرانی ئایینی هیندۆس هاوڕان لەسەر ئەوەی کە ڤێداس و کتێبە پیرۆزەکانی تری ئایینی هیندۆس ڕێگە دەگرن لە بت پەرستی، بەڵام لەبەر ئەوەی مێشک ڕەنگە بە تەواوی پێنەگەیشتبێت؛ بۆیە شتێک پێویستە بۆ جەختکردنەوە لە کاتی پەرستندا. دوای ئەوەی کە مێشک دەگاتە ئاگاییەکی بەرزتر چیتر بت پێویست نییە بۆ جەختکردنەوە.**

## وەڵام/

**١- موسوڵمانەکان گەیشتونەتە ئاستێکی بەرزی ئاگایی:**

ئەگەر شتێك پێویست بێت بۆ جەختکردنەوە (ترکیز) لە قۆناغەکانی سەرەتادا، دواتر کە مێشك گەیشتە ئاستێکی بەرزی ئاگایی ئەوا ئەو بتە پێویست نییە، ئەوا من دەڵێم کە موسوڵمانەکان گەیشتوونەتە ئاستێکی بەرزی هۆشیاری و ئاگایی، چونکە کاتێك کە خوا دەپەرستین پێویستی بە هیچ بت و پەیکەرێك نییە تا بمانگەیەنێت بەو ئاستە بەرزەی ئاگایی.

## ٢- منداڵ پرسیار دەكات بۆچی ئاسمان هەورە بروسكە دەكات؟

كاتێك من گفتوگۆ دەكەم لەگەڵ (IRF)دا هەندێك ئەو پرسیارە دەكەن كە منداڵەكانمان دەپرسن: «بۆچی ئاسمان هەورە بروسكە دەكات؟» ئێمە بەوە وەڵامیان دەدەینەوە كە: «دایكە گەورەمان لە ئاسمان ئارد دەهاڕێت»، لەبەرئەوەی كە زۆر بچووكە بۆ ئەوەی تێبگات. هاوشێوەی ئەمە لە قۆناغەكانی سەرەتادا خەڵكی پێویستیان بە بتێك هەیە بۆ ئەوەی جەخت بكەنەوە (تركیز) بكەنەوە.

لە ئایینی ئیسلامدا ئێمە بڕوامان بە وتنی درۆ نییە؛ تەنانەت درۆی سپیش، من هەرگیز ئەم وەڵامە درۆیانە نادەم بە منداڵەكەم، چونكە دواتر كە دەچێتە خوێندنگا ئەوە فێردەبێت كە هەورە بروسكە ڕووناكییەكە بەهۆی فراوان بوونی كتوپڕی هەوای گەرمەوە دروست دەبێت، ئەو بیر لەوە دەكاتەوە كە مامۆستاكەی درۆ دەكات، بەڵام كاتێك كە لە ڕاستییەكە تێدەگات بۆی دەردەكەوێت كە باوكی درۆی لەگەڵ كردووە، ئەگەر وا هەست دەكەیت كە منداڵەكە ڕەنگە لە شتە ئاڵۆزەكان تێنەگات؛ ئەوا پێویستە وەڵامی پرسیارەكەی سادە بكەیتەوە لە بری ئەوەی كە بە ناڕاستی وەڵامی بدەیتەوە. ئەگەر خۆت وەڵامەكەت نەزانی ئەوا پێویستە بەڕاستگۆیی و پێی بڵێیت: «من نازانم»، بەڵام زۆر منداڵی ڕۆژگاری ئەمڕۆ بەو وەڵامە ڕازی نابن، ئەگەر بە منداڵەكەی من بوترێت: «نازانم» ئەوا دەڵێت: « اوكە بۆچی نازانیت؟» ئەمە ناچارم دەكات كە هەوڵ بدەم و، وەكو منداڵەكەم خۆم پەروەردە بكەم.

**٣- ئەوانەی کە لە پۆلی یەکی سەرەتایین پێویستی بە بتێك هەیە بۆ جەختکردنەوە (٢+٢=٤)، ئەمە بە هەمان شێوە دەمێنێتەوە لە پۆلی یەکی سەرەتاییەوە تاکو پۆلی دە).**

هەندێك لە ڕەخنەگرەکان لەو کاتەی کە هەوڵ دەدەن بڕوا بە من بهێنن سەبارەت بە بت پەرستی دەڵێن: کە لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی خوێندکار لە سەرەتادا وا فێردەکرێت بۆ پەرستنی خوا ئەویش بە جەختکردنەوە بە یارمەتی بتێك، بەڵام کاتێك کە بەرەو پێش دەچێت چیتر پێویستی بە بتێك نابێت بۆ جەختکردنەوە لە کاتی پەرستنی خوادا. ڕاستییەکی زۆر گرنگ کە دەبێت تێبینی بکرێت ئەوەیە کە ئەگەر تەنها بنچینەکانی هەموو بابەتێك بەهێزن؛ بۆ نموونە مامۆستایەکی بیرکاری قۆناغی یەکی سەرەتایی خوێندکارەکانی وا فێر دەکات کە (٢+٢=٤) بە بێ گوێدانە ئەوەی کە هەرچەندە خوێندکارەکە خوێندنگا تێدەپەڕێنێت، یاخود دەبێت بە دکتۆر لە زانستی بیرکاریدا بنچینەی (٢+٢=٤) بە هەمان شێوە دەمێنێتەوە گۆڕانکاریی بەسەردا نایەت. لە قۆناغەکانی سەرووتری خوێندندا خوێندکار لەتەك کۆکردنەوەدا ڕەنگە جەبر و سێگۆشەزانی و لۆگاریتم ...هتد فێرببێت، بەڵام بنچینەکانی کۆکردنەوە بە هەمان شێوەی خۆی دەمێنێتەوە.

ئەگەر مامۆستاکە لە پۆلی یەك بنچینەکانی بە هەڵە فێری خوێندکارەکانی بکات؛ پێشبینی ئەوە دەکەین کە ئەو خوێندکارە لە داهاتوودا چۆن بێت؟ ئەگەر پرنسیپە بنچینەییەکانی ڤێداس سەبارەت بە خوا کە هیچ وێنەی نییە، کەواتە توێژەران چۆن ئەو ڕاستییە بزانن؟ دوای زانینی ئەو ڕاستییە

دەتوانن بێدەنگی هەڵبژێرن سەبارەت بەو پراکتیزە هەڵەیەی کە لە لایەن خەڵکەوە ئەنجامدراوە؟ ئایا تۆ بە کوڕەکەت دەڵێیت کە لە پۆلی یەکی سەرەتاییە کە (٢+٢ یەکسان نییە بە ٤، بەڵکو ٥ یان ٦)، تەنها ئەو ڕاستییە بسەلمێنە دوای ئەوەی خوێندن تەواو دەکات؟ هەرگیز، لە ڕاستیدا ئەگەر ئەو هەڵەیەك بكات ئەوا تۆ بۆی ڕاست دەکەیتەوە پێی دەڵیت دەکاتە (٤)، نەك بهێڵیت تاکاتی تەواو بوونی خوێندنی چاوەڕێی وەڵامە ڕاستەکە بکات و، ئەگەر لە سەرەتاوە بۆی ڕاست نەکەیتەوە ئەوا داهاتووی دەشێوێنیت.

# پرسیاری سی و هەشتەم

## ئاو چەند ناوێکی هەیە لە چەند زمانێکی جیاوازدا، خوا چەند ناوێکی هەیە لە چەند زمانێکی جیاوازدا

**«ئاو» بەچەند ناوێکی جیاواز لە چەند زمانێکی جیاوازدا ناسراوە وەکو: «water» لە زمانی ئینگلیزی، لە زمانی هیندیدا بە: «panni»، لە زمانی تامیدا بە «تانی» ...هتد، هاوشێوەی ئەمە ئەگەر بە «الله» بە ram و Jesus بانگ بکرێت خوا یەکێک نییە و هەمان خواش نییە؟**

## وەڵام/

١- «**الله**» ئاماژەیە بۆ جوانترین ناوەکانی خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە سوورەتی (الإسراء) خودا دەفەرموێت: {قُلِ ادْعُوا اللَّهَ أَوِ ادْعُوا الرَّحْمَنَ أَيًّا مَا تَدْعُوا فَلَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا} (الإسراء: ١١٠) واتە (پێیان بڵێ: لە نزاو دوعاکانتاندا ناوی پیرۆزی «**الله**» بەرن وەیان هاوار بە هەریەکێ لە سیفەتە پیرۆزەکانی ئەو بکەن، جا ئێوەش بە هەر ناو و سیفەتێکەوە لەو ناو و سیفەتانە بۆ خۆی دیاریکردوون دەتوانن داوای لێبکەن و هاواری بۆ بەرن چونکە ناوی پیرۆزی خوا زۆرن).

تۆ دەتوانیت خوا بە هەر ناوێك بێت بانگ بکەیت، بەڵام دەبێت ناوەکە

ناوێکی جوان بێت و، نابێت هاوتا بێت لەگەڵ وێنەیەکی هزریدا، دەبێت ناوێك بێت کە تایبەتمەندی خوای تێدا بێت.

## ٢- دەتوانرێت ئاو بە چەند ناوێکی جیا بە چەند زمانێکی تر بانگ بکرێت، بەڵام شتێکی تر لە پاڵ ئاودا ناتوانرێت بە ئاو بانگ بکرێت لە زمانێکی تردا.

تۆ دەتوانیت ئاو بە چەند ناوێك بانگ بکەیت بۆ نموونە: «water» لە زمانی ئینگلیزیدا، «panni» لە زمانی هیندیدا، «tannin» لە زمانی تامیدا و، «ماء» لە زمانی عەرەبیدا و، «apahin» لە زمانی سانسکریتدا، «jal» لە سودهـ هندیدا، «jalorpaani» لە گوجرەنیدا، «pandiin» لە مارسیدا، «neer» لە کاندا، «neemin» لە تیۆگو، «vellam» لە مەلایەلامدا ...هتد.

ئەگەر کەسێك پێم بڵێت کە هاوڕێیەکم ئامۆژگاری کردووم کە هەموو ڕۆژێك بەیانییەکەی پێویستە پەرداخێك «panni» بخواتەوە، بەڵام ئەو نەیتوانی بیخواتەوە، چونکە کاتێك کە دەیخواتەوە ئەوا وا هەست دەکات کە بڕشێتەوە، پرسیار دەکات دەڵێت کە «panni» ڕەنگی زەردە و بۆنی هەیە، دواتر بۆم دەردەکەوێت کە ئەوەی کە ئەو ئاماژەی بۆ دەکات «panni» ئاو نییە، بەڵکو میزە، هەرچەندە تۆ دەتوانیت ئاو بە چەند ناوێکی جیا بانگ بکەیت کە هەمان مانای ئاو دەگەیەنن، بەڵام تۆ ناتوانیت شتی تر بە «panni» یان ئاو بانگ بکەیت و بیناسیتەوە. خەڵکی ڕەنگە بیربکاتەوە کە ئەو نموونەیە ڕاستەقینە نییە، من هاوڕام لەگەڵیاندا چونکە تەنانەت کەسێکی زۆر گێلیش جیاوازی نێوان ئاو و میز دەزانێت و هەستی پێ دەکات، دەبێت زۆر گێل بێت بۆ ئەوەی بە میز بڵێت ئاو، هاوشێوە کاتێك

هەر کەسێك کە چەمکی ڕاستەقینەی خوا دەزانێت دەبینێت کە خەڵك خوای نادروست دەپەرستن؛ ئەوا بە شێوەیەکی سروشتی پرسیار دەکات کە چۆن کەسێك ناتوانێت جیاوازی بکات لە نێوان خوای ڕاستەقینە و خوای نادروست و دروستکراودا.

## ٣- پاکێتی خوا ناتوانرێت بسەلمێنرێت بە ناوهێنانی بە چەند ناوێکی جیا لە چەند زمانێکی جیاوازدا، بەڵام دەبێت بخرێتە سەنگی مەحەك.

ئاڵتون چەند ناوێکی هەیە لەوانە«sona» لە زمانی هیندا، «gold» لە زمانی ئینگلیزیدا، «الژهب» لە زمانی عەرەبیدا، سەرباری زانینی هەموو ناوە جیاکانی ئاڵتون، ئەگەر کەسێك بیەوێت ئاڵتونەکەی بە تۆ بفرۆشێت و بڵێت ئاڵتونەکەم عەیارە (٢٤)ە، خۆ تۆ کوێر نیت بە بێ ئەوەی بزانیت ئاڵتون چیە و، بێ ئەوەی ئەوە بسەلمێنێت کە ئەوە ئاڵتونی ڕاستەقینەیە یان نا، لە ڕێگەی مەحەکی ئاڵتونەوە نایکڕیت، ڕەنگە ئەو ڕەنگە زەردە درەوشاوەیە ئاڵتون نەبێت، چونکە هەموو شتێکی درەوشاوە ئاڵتون نییە.

## ٤- سوورەتی (الإخلاص) سەنگی مەحەکی ئاینزانییە:

هاوشێوەی ئەوە هەر کەسێك، یان هەڵبژێردراوێك کە ناوی خوای لێنرا ناتوانرێت وەکو خوای ڕاستەقینە قبوڵ بکرێت، بە بێ ئەوەی لە سەنگی مەحەکدا هەڵیبسەنگێنیت، سەنگی مەحەکی ئاینزانی کە لێکۆڵینەوەیە لە خوا لە سوورەتی (الإخلاص)دا لە قورئانی پیرۆزدایە: {قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ (١) اللَّهُ الصَّمَدُ (٢) لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ (٣) وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ (٤)}

واتە: (ئەی موحەمەد بڵێ: ئەو خوایەی کە من دەیپەرستم تاك و تەنیایە و هاوەڵ و هاوبەشی نیە، ئەو خوایەی ناوی «اللّٰه»یە جێگای هیوا و ئومێدە و بێ نیازیشە، کەسی لێ نەبووە، وە لە کەسیش نەبووە بێ دایك و باوکە، هەرگیز هیچ کەسێك هاوشێوە و هاوتای نییە و کەس ناتوانێت بەرهەڵستی بکات).

## ٥- دەبێت هەموو هەڵبژێردراوێك تاقیکردنەوە تێپەڕێنێت بۆ ئەوەی بتوانرێت پێی بوترێت خوا:

هەر هەڵبژێردراوێك کە داوا دەکات ببێت بە خوا و هاوشێوەی ئەو بێت؛ ئەوا پێویستە تاقیکردنەوە تێپەڕێنێت بۆ ئەوەی پێی بوترێت خوا و، وەکو ئەو بپەرسترێت، وا دابنێ کەسێك دەڵێت محەمەد خوایە، با بیخەینە تاقیکردنەوەکەی سوورەتی (الإخلاص)ەوە.

٥-١: {قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ} ئایا (محەمەد) تاك و تەنهایە؟ نەخێر ئەو تەنها پەیامبەر نەبووە، بەڵکو چەند پەیامبەرێکی تریش هەبوون.

٥-٢: {اللَّهُ الصَّمَدُ} ئێمە دەزانین کە (محەمەد) تاڵی زۆر چەشتووە هەرچەندە کە ئەو دەسەڵاتدارترین پەیامبەری خوابووە، لە تەمەنی (٦٣ ساڵ)یدا کۆچی دوایی کرد و لە (مەدینە) نێژرا.

٥-٣: {لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ} دەزانین کە ئەو لە مەککە لەدایکبوو و، دایك و باوکی ناویان (عبدالله) و (ئامینە) بوو، چەند منداڵێکی هەبوو لەوانە (...

ابراهیم ...هتد).

٥-٤: {وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ} هەرچەندە هەموو موسوڵمانان پێغەمبەریان خۆشدەوێت و ڕێزی لێدەگرن و، هەمووان دوای فرمانەکانی دەکەون، هێشتا تەنانەت تاکە موسوڵمانێك نادۆزیتەوە لە تەواوی دنیادا کە ژێر بێت بڵێت کە محەمەد خوایە، یاسا و ڕێبازەکەی ئیسلام بریتییە لە **«لا اله الا اللّٰه محمد رسول اللّٰه»** «هیچ خوایەك نییە جگە لە خوا و محەمەد پەیامبەری خوایە» دێت.

ئەمە لە کاتی نوێژدا ڕۆژی پێنج جار دووبارە دەبێتەوە، هەربۆیە کە موسوڵمانەکان ڕۆژانە ئەوەیان وەبیردێتەوە ڕێز لە پێغەمبەری خوا (د.خ) دەگرن و، فەرمانەکانی جێبەجێ دەکەن، ئەو تەنها پەیامبەر و خزمەتکاری خوایە نەك خوا!.

## ٦- ئەو خوایە بسەلمێنە کە دەیپەرستیت:

ئێستا کە بۆمان ڕوونکردنەوە کە چۆن سەنگی مەحەکی ئاینزانی بەکاردێت، ئەوە ئەرکی هەموو کەسێکە بۆ ئەوەی دەربکەوێت کە ئەو خوایەی دەیپەرستیت ڕاستەقینەیە یان نا.

# پرسیاری سی و نۆیەم

## ئایینی هیندۆسی کۆنترین و باشترین ئایین نییە

### ئایینی هیندۆسی کۆنترین وپاکترین و ڕاستەقینەترین و باشترینی هەموو ئایینەکانی دونیایە؟

## وەڵام/

**١- ئایینی ئیسلام کۆنترین ئایینە:**

ئایینی هیندۆسی کۆنترین ئایین نییە، ئەوە ئایینی ئیسلامە دێرینترینی ئایینەکانە، خەڵکی بەهەڵە لەوە تێگەیشتوون کە ئیسلام (١٤٠٠ ساڵ) تەمەنیەتی و، پێغەمبەریش (د.خ) دامەزرێنەری ئایینەکەیە. ئیسلام لە زەمەنی نەمرییەوە هەیە، لەو کاتەی کە مرۆڤ یەکەم هەنگاوی لەسەر زەوی داناوە، محەمەدی پەیامبەر (د.خ) دامەزرێنەری ئایینەکە نییە، بەڵکو ئەو پەیامبەری بە دەسەڵاتی خوایە.

**٢- دێرینترین ئایین پێویستە پاکترین و بە دەسەڵاترین ئایین بێت:**

ئایینێك ناتوانێت بانگەشەی پاکترین و بە دەسەڵاترین ئاین بۆ خۆی بکات؛ تەنها کاتێك بنچینەکانی کۆنترین نەبن، ئەمە هاوشێوەی کەسێکە دەڵێت ئاوی لە پەرداخێکی کراوەدا پاراستووە لە ماڵەکەی خۆیدا لە دەرەوەی بەستەر (سەلاجە)کەدا بۆ ماوەی سێ مانگ، پاکترە لە ئاوێك

کەلە پەرداخێکی پاکدا کۆکراوەتەوە و ڕاستەوخۆ دوای ئەوە پاڵێوراوە.

## ٣- کۆتا ئایین دەبێت پاکترین و بە دەسەڵاترین ئاین بێت:

لەلایەکی ترەوە ئایینێك ناتوانێت بانگەشەی پاکترین و بە دەسەڵاترین ئاین بۆ خۆی بکات؛ تەنیا کاتێك بنچینەکانی نوێ و تازەترین نەبن، بوتڵێك لە ئاوی دڵۆپێنراو کە لە دەبە نراوە و پارێزراوە لە سەلاجەدا بۆ ماوەی سێ مانگ؛ پاکترە لە بوتڵێك ئاو بە سازگاری لە دەریا کۆکراوەتەوە.

## ٤- بۆ ئایینێك کە پاك و بە دەسەڵات بێت نابێت خۆ تێهەڵقورتان و گۆڕانکاری و پێداچوونەوە و پاکسازی لە کتێبە پیرۆزەکەیدا بکرێت کە لەلایەن خواوە دابەزیوە:

بۆ هەر ئایینێك کە پاك و بە دەسەڵات بێت، نابێت کتێبە پیرۆزەکەی هیچ زیادکردنێك و سڕینەوە و پێداچوونەوە و هەڵەچنی تێدا بێت، سەرباری ئەوە سەرچاوەی سروش و ئاڕاستەکردنی ئایینەکە پێویستە خوای تاك و بەدەسەڵات بێت.

قورئان تەنها کتێبی پیرۆزە لەسەر ڕووی زەوی کە لە شێوازە سەرەکی و بنچینەیەکەی خۆی درێژەی پێدراوە، هەموو کتێبە پیرۆزەکانی تری هەموو ئایینەکان زیادکردن و سڕینەوە و پێداچوونەوە و هەڵەچنی تێدایە. قورئان لە هزر و بیری زۆرێك لە خەڵکیدایە، لە ڕاستیدا لەو شێوە سەرەکییەی لەو کاتەی کە بۆ پەیامبەر دابەزیوە، ئێستا زیاتر لەوە سەدان هەزار خەڵکی

هەن کە قورئانیان لە هزر و مێشکیان پاراستووە و لەبەریانکردووە، سەرەڕای ئەمەش ئەگەر تۆ بەراوردی ئەو کۆپییانە بکەیت کە لەلایەن خەلیفە عوسمانەوە دروستکراوە لە قورئانە سەرەکییەکەوە کە ئێستا هەیە و، لەبەردەستە لە مۆزەخانەی تۆپقاپی لە وڵاتی تورکیا، ئەوا هەمان ئەو قورئانەیە کە ئەمڕۆ لەبەردەستە، خودا لە قورئاندا لە سوورەتی (الحجر) دا بەڵێنی داوە: {إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ} (الحجر: ٩)، واتە: (بەڕاستی ئێمە خۆمان ئەم قورئانەمان ناردۆتە خوارەوە و هەرخۆشمان ئاگادار و پارێزەری دەبین).

## ٥- کۆنترین ئایین پێویستە باشترین ئایین بێت.

ئایینێك ناتوانێت بانگەشەی باشترین ئایین بۆ خۆی بکات تەنیا کاتێك کە بنچینەکانی کۆنترین نەبن، ئەمە هاوشێوەی ئەوەیە کە کەسێك دەڵێت ئۆتۆمبیلەکە هی سەدەی (١٩)یـە؛ باشترە لە ئۆتۆمبیلی جۆری تۆیۆتا (١٩٩٨ز) لەبەرئەوەی کۆنترە، ئەوە گێلێتییە کە بڵێیت ئەو ئۆتۆمۆبیلەی کە هی سەدەی (١٩)یە پێویستی بە دار بوو بۆ ئەوەی ئیش بکات، باشترە لەوەی کە بە سویچ دابگیرسێت تەنها لەبەر ئەوەی کە کۆنترە.

## ٦- دواهەمین ئایین دەبێت باشترین بێت:

لەلایەکی ترەوە ئایینێك ناتوانێت خۆی بە باشترین ئایین دابنێ تەنیا بنچینەکانی ئەو ئایینە نوێ یاخود دواتر نەهاتبن،

ئەمە وەکو کەسێك وایە کە دەڵێت ئۆتۆمبیلەکەم لەجۆری (cc ٨٠٠ سازۆکییە) کە لە ساڵی (١٩٩٩ز) دروستکراوە، باشترە لە ئۆتۆمبیلی

جۆری (مارسیدس ٥٠٠ SEL) کە لە ساڵی (١٩٩٧ز) دروستکراوە، بۆ ئەوەی بڕیار بدەیت کام ئۆتۆمبیلە باشترە ئەوا پێویستە بە وردی سەیری تایبەتمەندییەکانی ئۆتۆمبیلەکە بکەیت؛ بۆ نموونە هێزی ئۆتۆمبیلەکە، خێراییەکەی، ئاستی ئاسوودەیی ....هتد، ئۆتۆمبیلی جۆری (مارسیدس ٥٠٠ SEL) کە لە ساڵی (١٩٩٧ز) دروستکراوە زۆر باشترە و ئاست بەرزترە لە ئۆتۆمبیلی (٨٠٠ cc سازۆکی) کە لە ساڵی (١٩٩٩ز) دروستکراوە.

## ٧- ئایینێك باشترینە ئەگەر چارەسەری بۆ کێشەکانی مرۆڤ پێ بێت:

بۆ ئایینێك کە بە باشترین دابنرێت دەبێت چارەسەری پێبێت بۆ هەموو کێشەکانی مرۆڤایەتی، دەبێت ئایینی ڕاستی بێت پێویستە بۆ هەموو تەمەنێك بگونجێت، ئایینی ئیسلام تاکە ئایینە کە چارەسەری پێیە بۆ هەموو کێشەکانی مرۆڤایەتی، بۆ نموونە کێشەی مادده کحولییەکان، زیاد لە هەبوونی ژنێك، لاقەکردن و ئازاردان، دزیکردن، ڕەگەزپەرستی، چینی کۆمەڵایەتی ...هتد، ئایینی ئیسلام ئاینی ڕاستییە یاساکان و چارەسەرەکانی بۆ هەموو تەمەن و ئاستێك دەبێت، قورئان تەنها کتێبی ئایینە کە لەسەر ڕووی زەوی بە پاکی ماوەتەوە و لە هەموو سەردەمێکدا قسەی خودا بووە، بە مانایەکی تر لە پێشتردا کاتێك کە سەردەمی موعجیزە و ئەدەب و هۆنراوە بوو؛ تا کاتی ئێستا کە سەردەمی زانست و تەکنەلۆژیایە، سەرەڕای ئەمەش ئایینی ئیسلام ئاینی دەستکردی مرۆڤ نییە، بەڵکو ئایینێکە کە لە لای خوای بەدەسەڵاتەوە بە سروش هاتووەتە خوارێ و، تەنیا ئایینێکە لای خوا پەسەندکرابێت.

# پرسیاری پرسیاری چلەم

## ئایا خوا لە کتێبە پیرۆزەکانی تردا ناوی هاتووە؟

**«اللّٰه» گونجاوترین ناوە بۆ خوا لە قورئاندا. ئایا «اللّٰه» لە کتێبە پیرۆزەکانی تر بێجگە لە قورئان ئاماژەی بۆ کراوە یان ناوی هێنراوە؟**

## وەڵام/

**١- نزیکەی زۆرینەی کتێبە پیرۆزە ئایینیەکان وشەی «الله»یان تێدایە وەك ناوێك بۆ خوا.**

**٢- ئیلاهم، ئیلاه، ئەلاه:**

لە ئینجیلدا خوا زۆرجار بە ئیلاهم ئاماژەی بۆ کراوە، لە زمانی عبریدا «هم» لە کۆتایی وشەکەدا ئاماژەیە بۆ شێوەی (کۆ)ی شکۆمەندی، خوا بە (ئیلا) یان (ئیلاە) لە زمانی ئینجیلی ئینگلیزیدا ئاماژەی بۆ کراوە بە ڕوونکردنەوە (ئیلاە) ؛ بە شێوەیەکی تر وەکو (ئەلاە) ڕێنووس دەکرێت، موسوڵمانەکان خوا بە «**اللّٰه**» ڕێنووس دەکەن و بە «**اللّٰه**» دەیخوێننەوە، لە کاتێکدا ئەمان بە (ئەلاە) ڕێنووسی دەکەن و بە (ئیلاە) دەیخوێننەوە، زمانی عەرەبی و عیبری خوشکە زمانن، کەواتە دەڵێین کە پێویستە بە «**اللّٰه**» بخوێنرێتە نەك بە (ئیلاە).

**یەکەم:** مەسیح هاواری کردووە (**اللّٰه، اللّٰه**) کاتێك کە لە خاچیانداوە: لە (Gospel of Mathew) زنجیرەی (٢٧) بەشی (٤٦) و، (Gospel of Mark) زنجیرەی (١٥) بەشی (٣٤)ی (The New Testament) ئاماژەی بۆ کراوە کە کاتێك مەسیح لە خاچدراوە بە دەنگێکی بەرز هاواری کردووە: (?E›-Li, E›-Li, la› –ma sa- bach›- tha- ni) ئەم قسەیەی حەزرەتی مەسیح لە هەموو ئەو وەرگێڕانەی کە لە بەردەستن کە زیاترن لە (٢٠٠٠) زمانی جیاواز لە هەموو جیهاندا لە هەموویاندا بە مانای «الله الله بۆچی بە جێت هێشتم؟» دێت.

**دووەم: «اللّٰه»** لە (ئاینی سیخ)دا:
یەکێك لەو ناوانەی کە لەلایەن گورونەك ساهیب بەکارهاتووە ئاماژەیە بۆ خوا وشەی «**اللّٰه**»یە.

## ٣- «اللّٰه» لە کتێبی ڕگیڤدا سروودی ئایینی (١) بەشی (٢):

تەنانەت لە رگیڤدا کە کتێبێکی زۆر پیرۆزی ئایینی هیندۆسەکانە وشەی (الا) هاتووە کە بە تەواوی بە «**اللّٰه**» دەخوێنرێتەوە.
.

## ٤- ئەلۆ ئەپانیشاد:

لە نێوان چەند جۆرێکی جیاواز لە ئەپانیشاددا یەکێکیان ناوی (ئەلۆ ئەپانیشاد)ە لە چەند کاتدا وشەی «**اللّٰه**» بەکارهاتووە بۆ ئاماژەکردن بە خوا.

# پرسیاری چل و یەکەم

## ناشتن باشترە لە سووتاندنی جەستەی کەسی کۆچکردوو

**بۆچی موسوڵمانان جەستەی کەسی مردوو لە خاکدا دەنێژن لە جیاتی سووتاندنیان؟**

## وەڵام/

### ١- پێکهاتەی جەستەی مرۆڤ لە خۆڵدا بوونی هەیە:

ئەو پێکهاتانەی لە جەستەی مرۆڤدا هەن بە بڕێکی زۆرتر یان کەمتر لە خاکدا بوونیان هەیە، لەم ڕووەوە زانستی ترە کە جەستەی کەسی مردوو بنێژرێت کە بەئاسانی شیتەڵ دەبێت و لەگەڵ خاکەکەدا یەك دەگرێتەوە.

### ٢- پیس نەبوونی ژینگە:

سووتاندنی جەستەی مردوو دەبێتە هۆی پیسبوونی بەرگە هەوای زەوی؛ کە زەرەرمەندە بۆ تەندروستی و ژینگە، هیچ پیسبوونێکی ژینگە دروست نابێت ئەگەر بێت و کەسە مردووە کە بنێژرێت.

### ٣- خاکی دەورووبەری بە پیت دەبێت:

بۆ سووتاندنی جەستەی کەسێك چەندین دار دەبێت ببڕدرێت، کە ئەمەش دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی ڕێژەی سەوزی و زیان بە ژینگە دەگەیەنێت،

کاتێك جەستەی مردوو دەنێژرێت لەگەڵ ئەوەی کە درەختەکان دەپارێزین خاکی دەوروبەریشی بە پیت دەبێت و ژینگەش بەرەو پێش دەچێت.

### ٤- لایەنی ئابووری:

سووتاندنی جەستەی کەسی مردوو گران دەکەوێت ئەویش بەهۆی سووتاندنی چەند تەنێك دار کە دەبێت بسووتێنرێت، ساڵانە لە وڵاتی هینستان چەندان ملیۆن ڕووپیە لەدەست دەدەن بە هۆی سووتاندنی کەسانی مردووەوە، ناشتنی کەسی مردوو لەڕووی ئابوورییەوە هەرزانتر دەکەوێت و کەمتری تێدەچێت.

### ٥- هەندێك خاك دەتوانرێت جارێکی تر بەکاربهێنرێتەوە بۆ ناشتنی مردووی تر:

ئەو دارەی کە لە سووتاندنی کەسێکدا دەسووتێنرێت ناتوانرێت جارێکی تر بۆ سووتاندنی جەستەی کەسێکی تر بەکاربهێنرێتەوە، چونکە دەبێت بە خۆڵەمێش، ئەو خاکەی کە مردووی تێدا دەنێژرێت دوای تێپەڕبوونی چەند ساڵێك و شیبوونەوەی جەستەی مردووەکە بە تەواوی، دەتوانرێت جارێکی تر مردووی تێدا بنێژرێتەوە.

# پرسیاری چل و دووەم
## بندی و مانگالوسترا

**بۆچی ئافرەتی شووکردووی موسوڵمان بندی، یاخود تیکاون بە نێو چەوانیانەوە نییە و مانگالوسترا لەبەرناکەن وەک ئافرەتی شووکردووی هیندی؟**

## وەڵام/
### بندی یان تیکە
بندی لە(بندو)ی زمانی سانسکریتەوە وەرگیراوە کە بەمانای (خاڵ) دێت، بە شێوەیەکی هەمیشەیی ئەو خاڵە لە تۆزێکی ڕەنگ سووری تێر دروست دەکرێت کە دەکەوێتە نێوان برۆکان و نێوچەوانی ئافرەتی هیندییەوە، بندی بە هێمای (پارڤاتی) دادەنرێت و، هێمای وزەی ئافرەتە لەلایەن ئایینی هیندۆسەوە، باوەڕ وایە کە ئافرەت و پیاوەکەی دەپارێزێت، وەکو نەریت هێمای شووکردنە و ئافرەتی شووکردوو دەیپۆشێت، هەروەها پێی دەوترێت: (ئەستیکا).

### ٢-بندی بووە بە مۆدە:
لە ڕۆژگـاری ئەمڕۆدا بندی بووە بە مۆدە، تەنانەت کچێك کە شووی نەکردووە دەیپۆشێت، شێوەی بندی چیتر لە خاڵدا نەماوەتەوە ئێستا لەچەند شێوەیەکی تردا هەیە لەوانە شێوەی هێلکەیی، ئەستێرەیی،

شێوەی دڵ ...هتد، تەنانەت بێجگە لە ڕەنگی سوور بە چەند ڕەنگێکی تر دەردەکەوێت لەوانە: شین، سەوز، زەرد پرتەقاڵی ...هتد، ماددەکانی بندی گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە.

### ٣- مانگالستورا

مانگالستورا بە مانای دەزووی بەختی باش دێت؛ کە ملوانکەیە کە بە تایبەت لەلایەن ئافرەتی شووکردووی هیندییەوە لەمل دەکرێت کە هێمایە بۆ شووکردنی. ئەو ملوانکەیە پێکدێت لە دوو دەنك لە دەنکۆڵەی ڕەش لەگەڵ زنجیرێك کە بە شێوەیەکی هەمیشەی ئاڵتوونە، دەنکە ڕەشەکان بەمەبەستی پارێزگاری لە خراپە بەکاردێت؛ کە باوەڕ وایە هاوسەرگیری و ژیانی ئافرەتەکە دەپارێزێت لەلای مێردەکەی، لە باشووری هیندستان بە مانگالستورا دەوترێت (تالی). ئافرەتی شووکردووی هیندی هەرگیز نابێت مانگالستوراکەی دابنێت تەنها ئەو کاتە نەبێت کە دەبێت بە بێوەژن.

### ٤- خوا خۆی پارێزەرە:

خوا دروستکاری ئێمە؛ باشترین پارێزگاری مرۆڤایەتییە، ئێمە پێویستمان بە هیچ خاڵێکی سوور و ملوانکەیەك نییە کە لە خراپەکاریی بمانپارێزێت. لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە دەفەرموێت: {لِ اللَّهُ مَوْلَاكُمْ وَهُوَ خَيْرُ النَّاصِرِينَ} (آل عمران: ١٥٠)، واتە: (گوێ بۆ ئەوانە مەگرن، دۆست و یارمەتیدەر و سەروەری ئێوە تەنها و تەنها خوای گەورەیە و هەر ئەو یارمەتی ئێوە دەدات). لەچەند شوێنێکی تری قورئاندا ئاماژەی پێکراوە، لەبەرکردنی بندی، یاخود مانگالستورا بێ باوەڕییە بە دەسەڵاتداری خوای

دروستکاری ئێمە کە باشترین پارێزەرە.

## ٥- دژی جل و بەرگی ئیسلامی:

بندی و مانگالستورا هێمای ئافرەتی هیندییە جلوبەرگی ئیسلامی ڕێگە بە هیچ هێمایەك و نیشانەیەك نادات کە ئاماژە بێت بۆ ناموسوڵمانەکان.

## ٦- لە ئیسلامدا ئافرەتی شووکردوو و شوونەکردوو پێویست نییە گاڵتەیان پێبکرێت:

جارێکیان هاوڕێیەکی هیندۆسیم لە کاتی ئاماژەکردن بە سوودەکانی **مانگالستورا وتی:** کە ئاسانکارییە بۆ ئەوەی ئافرەتی شووکردوو و شوونەکردوو لەیەکتری جیابکەیتەوە، ئەمەش ڕێگری دەکات لە گاڵتەکردن و ئازاردانیان، بەپێی ئایینی ئیسلام هەموو ئافرەتێك چ جا شووی کردبێت یان نا، موسوڵمان بێت یاخود نا، نابێت گاڵتەی پێبکرێت یاخود ئازار بدرێت.

# پرسیاری چل و سێهەم

## وتنی ناوی ئیمپراتۆر ئەکبەر لە بانگدا:

**بۆچی موسوڵمانان ناوی ئیمپراتۆر ئەکبەر بەکاردێنن لەکاتی بانگکردنی موسوڵمانان بۆ نوێژکردن؟**

## وەڵام/

**١- ناموسوڵمانەکان بە هەڵە لە ناوی ئیمپراتۆر ئەکبەر تێگەیشتوون لە بانگدا.**

جارێکیان کاتێك بەشداریم لە کۆنفراسێکدا کرد لە کێرلا، وەزیرێکی ناموسوڵمان لە پێش وتارەکەی منەوە قسەی کرد، ئەو هەوڵ و ڕۆڵی موسوڵمانەکانی بەرز ڕاگرت لە بەرەوپێشچوونەکانی وڵاتی هیندستان وتی: لە نێوان پاشاکانی هیندستاندا مەزنترینیان ئیمپراتۆر ئەکبەر بووە، گومانی تێدا نییە کە موسوڵمانەکان لە ڕۆژێکدا پێنج جار لەکاتی بانگداندا ناوی ئەو دەهێنن، کاتێك کە نۆرەی قسەکانی من هات ئەو هەڵە تێگەیشتنەم بۆ ڕوونکردنەوە.

**٢- وشەی ئەکبەر لە بانگداندا هیچ پەیوەندییەکی بە ئیمپراتۆر ئەکبەرەوە نییە:**

وشەی ئەکبەر کە لە بانگدا ئاماژەی بۆ کراوە لەکاتی بانگکردنی موسوڵمانان

بۆ نوێژکردن؛ هیچ پەیوەندییەکی بە ئیمپراتۆر ئەکبەری هیندستانەوە نییە، ئەو وشانەی کە لە بانگداندا بەکاردێت می چەند سەدەیەك پێش لە دایکبوونی (ئیمپراتۆر ئەکبەر)ە.

### ٣- وشەی ئەکبەر بەمانای مەزن دێت:

وشەی عەرەبی ئەکبەر بەمانای مەزن دێت کاتێك دەڵێن: **(اللّٰه أكبـر)** لە بانگداندا، ئەوە ئاماژەیە بۆ (خوای گەورە و مەزن)، یاخود (خوا مەزنترینە)، کاتێك کە بانگی خەڵك دەکەین بۆ پەرستن؛ خوای تاك و تەنیا مەزنترینە.

# پرسیاری چل و چوارەم

## بۆچی موسوڵمانەکانی هیندستان پەیڕەوی یاسای تاوانی ئیسلام ناکەن؟

**کاتێك کە موسوڵمانەکانی هیندستان جەخت دەکەنەوە لەسەر هەبوونی یاسای تاکە کەسی جیا بۆ خۆیان، بۆچی ئەوان جەخت لەسەر جێبەجێکردنی یاسای تاوان بۆ موسوڵمانەکان ناکەنەوە، بۆ نموونە جێبەجێکردنی ئەو یاسایەی کە دەبێت دەستی کەسی دز ببڕێت ئەگەر موسوڵمانێك دزیکرد؟**

## وەڵام/

### ١- یاسای کەسی موسوڵمانەکان:

یاسای باری کەسی یاسایەکە کە پەیوەستە بە تاکەوە و، مرۆڤەکان بە تەواوی پەیوەستن پێوەی، بۆ نموونە: یاسای شووکردن، جیابوونەوە، میرات ...هتد و، ئەو یاسایانەش دەگرێتەوە کە لەلایەن کۆمەڵێك کەسەوە هاوڕان لەسەری، ئەم یاسایە هیچ تاوان و کارێکی تێدا نییە کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئازار، یان زیان بە کۆمەڵگا بگەیەنێت.

## ٢- هیندستان عەلمانی و دیموکراتییە:

لەهەر وڵاتێك یاسای کەسی ڕەنگە جیاواز بێت، بۆ کۆمەڵێك خەڵك، بۆ کۆمەڵگای جیاواز، هەرچەندە هیندستان وڵاتێکی عەلمانی و دیموکراتییە ڕێگە بە کۆمەڵە خەڵکی جیاواز دەدات کە پەیڕەوی یاسای کەسی خۆیان بکەن کە ئارەزوویانە.

## ٣- یاسای کەسی باشترین یاسایە:

موسوڵمانەکان بڕوایان وایە کە بە بەراورد بە هەموو جۆرە جیاوازەکانی یاسای کەسی کە لە دونیادا هەیە، باشترینیان یاسای کەسی ئیسلامە، موسوڵمانەکانی هیندستان پەیڕەوکردنی یاسای کەسی موسوڵمانانیان پێ باشترە لەبەر بڕوابوونیان بە ئاینی ئیسلام.

## ٤- یاسای تاوان:

یاسای تاوان یاسایەکە کە پەیوەستە بە تاوان و ئەو کردەوانەی کە ڕاستەوخۆ کاریگەری دەخەنە سەر کۆمەڵگا، وەکو دزیکردن و لاقەکردن و کوشتن ...هتد.

## ٥- یاسای تاوان نابێت بۆ هەموو کەسێك وەك یەك بێت:

لەهەر وڵاتێکدا یاسای تاوان وەکو یاسی کەسی نییە، یاسای تاوان نابێت جیاواز بێت بۆ کۆمەڵە خەڵکی جیاواز، دەبێت یاسایەك بێت بۆ هەموو کۆمەڵ، خەڵکی جیاواز و کاتی جیاواز، بۆ نموونە: لە ئایینی ئیسلامدا ئەگەر کەسێك دزی بکات دەبێت دەستی ببڕدرێت، ئەم سزایە لە ئایینی

هیندۆسدا نییە ئەگەر هیندۆسێك دزی لە موسوڵمانێك كرد دەبێت سزای دزەكە چی بێت؟ موسوڵمانەكە دەیەوێت دەستی دزەكە ببڕێت، لە كاتێكدا یاسای هیندۆسەكە ڕێگە نادات و ڕازی نابێت.

## ٦- موسوڵمانەكانی هیندستان بە تەنها ناتوانن بە جیا پەیڕەوی یاسای تاوان بكەن بە بێ جێبەجێكردنی یاساكە بەسەر ناموسوڵمانەكانیشدا.

هەرچەندە ئەگەر موسوڵمان ڕازی بێت كە ئەگەر تاوانێكی ئەنجامدا سزا بدرێت بە گوێرەی یاسای تاوانی ئیسلامی؛ ئەوا پراكتیكی نابێت لە حاڵەتێكدا دزییەك دژ بە موسوڵمانان ئەنجام بدرێت ئەگەر شایەت حاڵەكە ناموسوڵمان بوو و، ئەگەر كەسێك یاسای تاوانی خۆی پەیڕەو بكات، سزا لە ئایینی ئیسلامدا بۆ شایەتدانی ناڕاست (٨٠) جەڵدە، لەكاتێكدا ئەگەر كەسێك شایەتی نادروست بدات؛ ئەوا بەپێی یاسای تاوانی ئەوان ئەوا كەسەكە بە ئاسانی دەتوانێت ڕابكات، ئەوا بۆ ناموسوڵمانێك ئاسان دەبێت كە موسوڵمانێك بە ناڕەوا تاوانبار بكات، چونكە سزا بەپێی یاسای هیندەكان زۆر نەرمە بۆ دزیكردن و شایەتدانی ناڕاست، ئەمەش هانی دزەكان دەدات كە بەردەوام بن لە دزیكردن، لەهەمانكاتدا هانی ئەو كەسانەش دەدات كە شایەتی ناڕاست دەدەن بەردەوام بن لە شایەتدانی ناڕاست لەبەر بەرژەوەندی خۆیان.

## ٧- موسوڵمانەکانی هیندستان یاسای تاوان لە ئایینی ئیسلامیان لاپەسەندە جێبەجێ بکرێت بەسەر هەموو هیندەکاندا:

ئێمەی موسوڵمانان پێمان باشە یاسای تاوانی ئیسلامی بەسەر هەموو هیندەکاندا جێبەجێ بکرێت، چونکە بڕینی دەستی دز بە دڵنیاییەوە تێکڕای کرداری دزیکردن لە وڵاتی هیندستان کەمدەکاتەوە، هاوشێوەی ئەمە (٨٠) جەڵد بۆ کەسێك کە شایەتی ناڕاست دەدات؛ ڕێگر دەبێت لە شایەتدانی ناڕاست و درۆ.

## ٨- یاسای تاوان لە ئیسلامدا زۆر پراکتیکییە:

ئایینی ئیسلام لە پاڵ ئاماژەکرنی بۆ تاوان لەگەڵ ئەوەشدا چارەسەری ئەوەشی خستووەتەڕوو کە چۆن ڕێگری بکرێت لە تاوان، بۆ نموونە بڕینی دەستی کەسێك کە دزی ئەنجام دەدات، سزای مردن بۆ ئەو کەسانەی دەستدرێژی سێکسی بۆ سەر کەسانی تر ئەنجام دەدەن. بۆیە لەکاتی جێبەجێکردنی ئەم جۆرە سزایانە؛ کەسێك ئەگەر نیازی ئەنجامدانی تاوانێکی هەبێت ئەوا پێش تاوانەکە سەدجار بیردەکاتەوە لە سزاکەی، بۆیە بۆ کەمکردنەوە و وەستانی تاوان لە وڵاتی هیندستان باشترین چارەسەر جێبەجێکردنی یاسای تاوانە لە ئایینی ئیسلامدا.

# پرسیاری پرسیاری چل و پێنجەم

## ئایا ڕام و کریشنا پێغەمبەری خودان؟

**ئەگەر بە گوێرەی ئایینی ئیسلام لە دونیادا پەیامبەر بۆ هەموو نەتەوەیەک هاتووە؛ کەواتە چ پەیامبەرێک بۆ هیندەکان نێردراوە؟ ئایا دەتوانین وادابنێین ڕام و کریشنا پەیامبەری خودا بن بۆ هیندەکان؟**

## وەڵام/

### ١- پەیامبەر بۆ هەموو نەتەوەیەك نێردراوە:

**یەکەم:** لە قورئانی پیرۆزدا لە سوورەتی (فاطر) ئایەتی (٢٤) خوای گەورە دەفەرموێت: {إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ بِالْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَإِنْ مِنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ} (فاگر: ٢٤)، واتە: (ئێمە تۆمان نارد بە ئاینی ڕاست بە موژدەدەر و ترسێنەر بۆ مەردم، و هیچ ئوممەت و گەلێکیش نەبووە بەر لە تۆ ترسێنەرێکیان بۆ نەچوبێ).

**دووەم:** پەیامی هاوشێوەی ئەو ئایەتەی سەرەوە لە سوورەتی (الرعد): {وَيَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلَا أُنْزِلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِنْ رَبِّهِ إِنَّمَا أَنْتَ مُنْذِرٌ وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ} (الرعد: ٧)، واتە: (خوانەناس و بێ باوەڕەکانیش بە عینادیی و ئیرەیی خۆیان دەڵێن: ئەوە بۆچی لەلایەن پەروەردگارەوە بەڵگەیەکی پتەو و

بەهێز نەنێردرایە سەر موحەمەد، خوا لە وەڵامیاندا فەرمووی تۆ هەر تەنها ترسێنەرێکی وە بۆ هەر گەلێکیش لە گەلانی دوونیا رێ نیشاندەرێك هەبووە).

## ٢- چیرۆکی تەنها هەندێك پێغەمبەر لە قورئاندا گێڕدراونەتەوە:

**یەکەم:** خوای گەورە لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (١٦٤)دا دەفەرموێت: {وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِنْ قَبْلُ وَرُسُلًا لَمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا} (النساء: ١٦٤)، واتە: (وە لە پێشەوە چەند پێغەمبەرێکی تریشمان ناردووە -ئەوانە هەندێکیان لە ئایەتی (١٦٣) دا باسکراون- وە پێغەمبەر گەلێکی تریش هەن کە لە قورئاندا بۆم باس نەکردوویت، خوای میهرەبان بۆ خۆی ڕاستەوخۆ قسەی لەگەڵ موسادا کردووە بۆیە پێی دەگوترێ «کەلیم»).

**دووەم:** هاوشێوەی ئایەتەکەی سەرەوە خوای گەورە دەفەرموێت: {وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِنْ قَبْلِكَ مِنْهُمْ مَنْ قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُمْ مَنْ لَمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَنْ يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ فَإِذَا جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ قُضِيَ بِالْحَقِّ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْمُبْطِلُونَ} (غافر: ٧٨)، واتە: (سوێند ئەخۆم کە بەڕاستی لە پێش ئێوەشدا پەیامبەرێکی زۆرمان ناردووە هەریەك بۆ لای گەلی خۆی، داستانی هێندێکیانمان لە قورئاندا بۆ باسکردویت ئەوانیش بیست و پێنج پێغەمبەرن، هەندێکیشیانمان بۆ باس نەکردوویت، وە بۆ هیچ پەیامبەرێك نەبووە کە موعجیزەیەك بێنێ بەفەرمانی خوا نەبێت، جا هەرکات فەرمانی

خودا هاتبێت بە سزا بە دادگەری بڕیاردراوە لە نێوانیاندا، لەو کاتەدا ناهەقکارەکان زیانمەند و پەشیمان بوون، بەڵام پەشیمانی کەڵکی نەبووە بۆیان).

## ٣- (٢٥) پێغەمبەری خوا ناویان لە قورئاندا هاتووە:

بە ناو تەنها (٢٥) پێغەمبەری خوا ناویان لە قورئاندا هاتووە، لەوانە: ئادەم، نوح، ئیبراهیم، موسا، عیسا، محەمەد ...هتد.

## ٤-زیاتر لە (١٢٤٠٠٠) پێغەمبەری خوا هەن.:

بە گوێرەی فەرمایشتەکانی پێغەمبەر محەمەد (د.خ) زیاتر (١٢٤٠٠٠) پێغەمبەر نێردراوە بۆ زەوی لەلایەن خواوە.

## ٥- هەموو ئەو پێغەمبەرانەی کە پێشتر نێردراون تەنیا بۆ خەڵکەکەی خۆیان بوون:

هەموو ئەو پێغەمبەرانەی پێش محەمەد (د.خ) هاتوون تەنها بۆ خەڵکەکانی خۆیان نێردراون و، بۆ ماوەیەکی دیاریکراو.

## ٦- محەمەد (د.خ) کۆتا پەیامبەری خودایە:

پێغەمبەر محمد کۆتا پەیامبەری خودایە وەکو ئەوەی لە سوورەتی (الأحزاب) ئایەتی ٤٠ دا هاتووە {مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ وَلَكِنْ رَسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا} (الأحزاب: ٤٠)، واتە: (موحەمەد باوکی هیچ پیاوێکتان نییە، بەڵکو ئەو پەیامبەری خوایە و

دواهەمینی پەیامبەرانە، هەمیشە خوا بە هەموو شتێك زانایە و بە ئاگایە).

## ٧- پێغەمبەر محەمەد بۆ تەواوی جیهان نێردراوە:

هەرچەندە پێغەمبەر محەمەد (د.خ) کۆتا پێغەمبەرە، بەڵام ئەو تەنها بۆ موسوڵمانە عەرەبەکان نەنێردراوە، بەڵکو ئەو بۆ تەواوی مرۆڤایەتی نێردراوە.

**یەکەم:** لە سوورەتی (الأنبياء) ئایەتی (١٠٧) ئاماژەی پێکراوە: {وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ} (الأنبياء: ١٠٧)، واتە: (ئێمە هەربۆیە تۆمان نارد کە رەحمەت و بەزەیی و میهرەبانیەك بیت بۆ هەموو جیهانیان).

**دووەم:** ئایەتی هاوشێوەی ئەمە لە سوورەتی (سبأ) ئایەتی (٢٨)دا هاتووە: {وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ} (سبأ: ٢٨)، **واتە: (ئێمە هەربۆیە تۆمان نارد کە بۆ تەواوی خەڵکانی جیهان ببیتە مژدەدەر و ترسێنەر، بەڵام زۆرینەی خەڵکی ئەوە نازانن).**

**سێیەم:** لە صحیحی بوخاری بەرگی یەك لە کتێبی (صلاة) بەشی (٥٦) فەرموودەی ژمارە (٤٢٩) کە لەلایەن (جابری کوڕی عبدالله)وە گێڕدراوەتەوە، پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت: (هەموو پێغەمبەرەکان بۆ نەتەوەی خۆیان نێردراون تەنیا من نەبێت کە بۆ تەواوی مرۆڤایەتی نێردراوم).

## ٨- کام پێغەمبەر نێردراوە بۆ هیندستان؟

سەبارەت بەو پرسیارەی کام پێغەمبەر نێردراوە بۆ هیندستان؛ دەتوانین ڕام و کریشنا بە پێغەمبەری خوا دابنێین، هیچ دەقێکی قورئان، یان هیچ فەرموودەیەکی صەحیح نییە کە ئاماژەی بۆ ناوی پێغەمبەرێك کردبێت کە نێردرابێت بۆ هیندستان، هەرچەندە ناوی ڕام و کریشنا لە هیچ شوێنێکی قورئاندا، یان فەرموودەی صەحیحدا باس نەکراوە، کەس ناتوانێت بڵێت کە دڵنیابن لەوەی کە پێغەمبەری خودا بن یان نا.

هەندێك لە موسوڵمانەکان بە تایبەت موسوڵمانە سیاسییەکان کە هەوڵ دەدەن هیندۆسەکان ڕازی بکەن دەڵێن: ڕام (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە ئەمەش بە تەواوی هەڵەیە، هیچ سەلماندنێکی ڕاستەقینە نییە لە قورئان و فەرموودەدا کە ئەوە بسەلمێنێت کە ڕام و کریشنا پێغەمبەری خودان.

٩- هەرچەندە ئەگەر ڕام و کریشنا پێغەمبەری خوا بن، لەمڕۆدا پێویستە شوێنکەوتەی کۆتا پێغەمبەری خوا (د.خ) بین. ئەگەر وا دابنێین ڕام و کریشنا پێغەمبەری خوا بن؛ ئەوا تەنها پێغەمبەر بوون بۆ سەردەمێکی دیاریکراو، ئێستا هەموو مرۆڤایەتی لە تەواوی دنیادا بە هیندەکانیشەوە پێویستە شوێنکەوتەی کۆتا پێغەمبەری خوا بن، محەمەد پێغەمبەر (د.خ).

# پرسیاری چل و شەشەم

## ئایا ڤیداس سروشی خودایە؟

**ئەگەر خوا کتێب و سروشەکانی لە هەموو سەردەمێکدا ناردبێت؛ کەواتە چ کتێبێک یان سروشێک بۆ هیندستان نێردراوە؟ ئایا دەتوانین ڤێداس و کتێبە پیرۆزەکانی هیندۆس بە قسەی خوا بزانین؟**

## وەڵام/

**١- سروش لە هەموو سەردەمێکدا نێردراوە.**

لە سوورەتی (الرعد) ئایەتی (٣٨)دا هاتووە: {وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِنْ قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجًا وَذُرِّيَّةً وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَنْ يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ} (الرعد: ٣٨)، واتە: (بەڕاستی پێش تۆ پەیامبەرانمان ناردووە، هەروەکو تۆ ڕێگەمان دان کە ژن و منداڵیشیان هەبێ، وە هیچ پەیامبەرێکی بەر لەتۆش بۆی نەبووە لە خۆیەوە موعجیزەیەك بێنێ لەسەر داوای هۆزەکەی مەگەر بە فەرمانی خوا بووبێت بۆ هەموو سەردەم و بۆ هەموو کارێکی گرینگ و پێویست بڕیار و نامەیەکی تایبەتی هەیە لە خواوە نوسراوە و تۆمارکراوە).

**٢- چوار سروش و کتێبی خوا لە قورئاندا ئاماژەی بۆ کراوە:**

بە ناو تەنها چوار سروش و کتێبی خوا لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی بۆ کراوە،

ئەوانیش: تەورات، زەبور، ئینجیل و قورئان.

* تەورات بۆ موسا پێغەمبەر دابەزیوە.

* زەبور بۆ داود پێغەمبەر دابەزیوە.

* ئینجیل بۆ عیسا پێغەمبەر دابەزیوە.

* قورئان کە دوا کتێبی خوایە بۆ کۆتا پێغەمبەری خوا محەمەد (د.خ) دابەزیوە.

## ٣- هەموو کتێبەکانی پێشووتر بۆ خەڵکانی خۆیان نێردراون:

هەموو ئەو کتێب و سروشانەی کە پێش قورئان نێردراون تەنها بۆ خەڵکانی خۆیان و بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بووە.

## ٤- قورئان بۆ تەواوی مرۆڤایەتی نێردراوە:

هەرچەندە قورئان دوا کتێبە کە لەلایەن خواوە دابەزیوە، تەنها بۆ موسوڵمانە عەرەبەکان دانەبەزیوە، بەڵکو بۆ تەواوی مرۆڤایەتی نێردراوە وەك ئەوەی کە لە قورئاندا ئاماژەی پێکراوە.

**یەکەم:** سوورەتی إبراهیم : {الر كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ} (إبراهیم ئایەتی: ١) واتە: (ئەم قورئانە کتێبێکە ناردومانەتە خوارەوە بۆت، تا خەڵکی بە فەرمانی پەروەردگاریان لە تارکاییەکانی کوفر و نەزانی و نەفامی بێنە دەرەوە بۆ رووناکی و ئیمان و زانست، بۆ ڕێگا و بەرنامەی ئەو خوا بەدەسەڵات و بەتوانا و سوپاسکراوە لە هەردوو جیهانەکەدا).

**دووەم:** سوورەتی {هَذَا بَلَاغٌ لِلنَّاسِ وَلِيُنْذَرُوا بِهِ وَلِيَعْلَمُوا أَنَّمَا هُوَ إِلَهٌ وَاحِدٌ وَلِيَذَّكَّرَ أُولُواْ الْأَلْبَابِ} (إبراهيم: ٥٢)، واتە: (ئەم قورئانە ڕاگەیاندنێکی گەورە و مەزنە بۆ تەواوی خەڵکی جیهان لەهەر جێگایەك بن، هەتا هەموو خەڵکی لە سزای خوا پێ بترسێنرێت، تا چاکیش بزانن کە ئەو خودایە خوایەکی تاك و تەنیا و بێ شەریك و بێ هاوەڵە، وە تا خەڵکانێ بە ئارەزوو و هۆشیار پەند و ئامۆژگاری وەرگرن و پێی سەرفراز و بەختیار بن لە هەردوو جیهاندا).

**سێیەم:** سوورەتی (الزمر) ئایەتی (٤١): {إِنَّا أَنْزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ لِلنَّاسِ بِالْحَقِّ فَمَنِ اهْتَدَى فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَمَا أَنْتَ عَلَيْهِمْ بِوَكِيلٍ} (الزمر: ٤١)، واتە: (ئێمە ئەم قورئانەمان بە ڕێك و پێکی و ڕاست و دروست دابەزاندە سەر تۆ تا ڕابیگەیەنی بە ئادەمی و پەری، ئینجا هەر ئەوەی شارەزا و ڕێنما بوو ئەو قازانجی خۆیەتی، وە هەرکەسیش گومڕا و سەرلێشێواو بوو و گوێی بەفەرمانی خوا نەدا ئەوە بۆ خۆی گومڕا دەبێت تەنها بەخۆشی زیان دەگات، خۆ تۆش کار پێسپێردراو و بریکاری ئەوان نیت هەتا هیدایەتی ئەوانت لەسەربێ).

## ٥- چ کتێبێك بۆ هیندستان نێردراوە؟

لە وەڵامی ئەوەی: **(ئایا چ کتێبێك یان سروشێك بۆ هیندستان نێردراوە؟ ئایا دەتوانین ڤیداس و کتێبە پیرۆزەکانی تری ئایینی هیندۆس بە کتێب و سروشی خودا قبوڵ بکەین؟)** هیچ دەقێکی قورئان یان فەرموودەیەکی صەحیح نییە کە ئاماژەی بە ناردنی کتێب کردبێت کە لەلایەن خواوە

نێردرابێت بۆ هیندستان، چونکە ناوی ڤیداس و کتێبە پیرۆزەکانی هیندۆس لە هیچ شوێنێکی قورئان و فەرموودەی صەحیحدا ئاماژەی بۆ نەکراوە کە کتێبی خودا بن، ڕەنگە کتێبی خودا بن و ڕەنگە واش نەبن.

## ٦- هەرچەندە ئەگەر ڤیداس قسەی خودا بێت ئەمڕۆ دەبێت پەیڕەوی قورئان بکەین:

هەرچەندە ئەگەر ڤیداس و کتێبە پیرۆزەکانی تر کتیبی خودا بن و لەلایەن خواوە نێردرابن؛ ئەوا ئەو کتێبانە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بووە، لەمڕۆدا تەواوی مرۆڤایەتی لە تەواوی دونیادا بە هیندەکانیشەوە دەبێت تەنها پەیڕەوی دوا کتێبی خوا بکەن کە ئەویش قورئانە.

سەرباری ئەوەش هەموو کتێبەکانی پێشووتری خوا بۆ ئەوە نەبووە تا کۆتایی پەیڕەو بکرێت، هیچ کتێبێکی پیرۆز نییە لە هەر ئایینێکی سەرەکیدا کە وا دەرکەوێت کە قسەی خودا بن، ئەگەر دەقە ڕاستەقینەکەی بە پاکی نەمابێتەوە و هیچ گۆڕانکاری و چاکسازی و پاکسازییەکی تێدا نەکرابێت. قورئان بۆ ئەوەیە کە بۆ هەمیشە پەیڕەو بکرێت، خوا خۆی پاراستنی پاکی و پارێزگاریکردن لە قورئانی خستووەتە ئەستۆی خۆی لە تێکچوون و دەستکاریکردن، هەروەك چۆن لە قورئانی پیرۆز سوورەتی (الحجر) ئایەتی (٩) ئاماژەی پێکراوە: {إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ} (الحجر: ٩)، واتە: (ئێمە خۆمان ئەم قورئانەمان ناردۆتە خوارەوە و هەر خۆشمان ئاگادار و پارێزەری دەبین).

# پرسیاری چل و حەوتەم

## قورئان لە ئینجیلەوە وەرگیراوە؟

**ئایا ئەوە ڕاست نییە کە پێغەمبەر محەمەد قورئانی لە ئینجیلەوە کۆپی کردووە؟**

## وەلام/

زۆرێك لە ڕەخنەگران بانگەشەی ئەوە دەکەن کە پێغەمبەر (د.خ) خۆی خاوەنی قورئان نییە؛ بەڵکو ئەو قورئانی لە سەرچاوەی مرۆڤەکانی تر، یاخود لە کتێبە پیرۆزەکانی پێشووترەوە وەرگرتووە و کۆپی کردوون.

١- محەمەد لە ئاسنگەرێکی ڕۆمانییەوە کە مەسیحی بووە فێری قورئان بووە:

هەندێك لە بت پەرستان پێغەمبەر (د.خ) بە فێربوونی قورئان لە پیاوێکی ئاسنگەری ڕۆمانی تۆمەتبار دەکەن؛ کە ئایینی مەسیح بووە، کە لە دەرەوەی شاری مەککە دەژیا، پێغەمبەر (د.خ) زۆرجار وا ڕاهاتبوو بچێت بۆ لای و تەماشای کارەکانی بکات، ئایەتێکی قورئان بەسە بۆ پووچەڵکردنەوەی ئەو تۆمەتە، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز لە سوورەتی (النحل) ئایەتی (١٠٣)دا دەفەرموێت: {وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ لِسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُبِينٌ} (النحل: ١٠٣)، واتە: (ئێمە چاك دەزانین ئەوان پێتدەڵێن هەر ئادەمیە کە ئەم قورئانەی فێردەکات - مەبەستیان لە کابرایەکی رومی بوو- خۆ زمانی ئەو کەسەی ئەوان نیازیانە

ئەم قورئانە بدەنە پاڵی ئەو عەجەمیە و لە عەرەبیدا کۆڵ و نەزانە، ئەم قورئانەش بە زمانێکی عەرەبی خۆشخوان و ڕەوانبێژی ئاشکرایە).

چۆن کەسێك کە زمانی دایکی بێگانە بێت و بە قورسی بتوانێت تۆزێك عەرەبی قسە بکات؛ دەتوانێت سەرچاوەی قورئان بێت کە بە زمانێکی عەرەبی و پاراو و باش نووسراوەتەوە؟ بۆ بڕواکردن بەوەی کە ئاسنگەرێك وانەی بە پێغەمبەر (د.خ) وتووەتەوە؛ وەك ئەوە وایە بڕوا بەوە بکەیت کە چینییە کۆچکردووەکان بۆ بەریتانیا کە زمانی ئینگلیزییان بە باشی نەدەزانی وانەیان بە شکسپیر وتبێت.

## ٢- محەمەد (د.خ) لە (وەرقـــە)ەوە فێربووە کە خزمی خەدیجە بووە:

پەیوەندی محەمەد (د.خ) لەگەڵ توێژەرە مەسیحی و جولەکەکاندا زۆر سنووردار بووە، یەکێك لەو مەسیحییانەی کە پێغەمبەر (د.خ) زۆر دەیناسی؛ پیاوێکی نابینا بوو کە ناوی (وەرەقە کوڕی نەوفل) بوو کە خزمی هاوسەری یەکەمی پێغەمبەر بوو، هەرچەندە بە ڕەچەڵەك عەرەب بوو، بەڵام ئەو دینەکەی گۆڕیبوو بۆ سەر ئایینی مەسیحی. پێغەمبەر تەنها دووجار چاوی پێکەوت، یەکەم جار کاتێك (وەرەقە) خەریکی خوا پەرستی بوو لە کەعبە (پێش ڕاگەیاندنی پێغەمبەرایەتی محەمەد) بە دڵسۆزی و خۆشەویستییەوە ناوچەوانی پێغەمبەری ماچ کرد، دووەمجار کاتێك پێغەمبەر (د.خ) چوو بۆ بینینی (وەرەقە) پاش پێگەیشتنی یەکەم سروش لەلایەن خواوە بوو، (وەرەقە) دوای (سێ ساڵ) کۆچی دوایی کرد و، هاتنە خوارەوەی سروش بۆ ماوەی (٢٣ ساڵ) بەردەوام بوو، ئەوە مایەی گاڵتەپێکردنە کە بڵێیت

(وەرەقە) سەرچاوەی ناوەڕۆکی قورئان بووە.

## ٣- گفتۆگۆی ئایینی پێغەمبەر (د.خ) لەگەڵ جولەکە و مەسیحییەکاندا:

ئەوە ڕاستییە کە پێغەمبەر (د.خ) لە شاری مەدینە مناقەشە و گفتوگۆی ئایینی لەگەڵ جولەکە و مەسیحییەکاندا کردووە؛ بۆ ماوەی زیاتر لە (١٣ ساڵ) دوای دەستپێکردنی دابەزینی قورئان لە لایەن خواوە، ئەو بانگەشانەی کە جولەکە و مەسیحییەکان سەرچاوەی قورئانن زۆر نامەعقولن، لە گفتوگۆکانیاندا پێغەمبەر ڕۆڵی مامۆستایەکی دەگێڕا؛ لە کاتێکدا کە بانگی دەکردن بۆ ئەوەی بێنە ناو ئایینی ئیسلامەوە و، ئاماژەکردن بۆ ئەو شتانەی کە لە یەکتاپەرستیدا لێیان لاداوە، چەندین لەو مەسیحی و جولەکانە دواتر موسوڵمانبوونی خۆیان ڕاگەیاند.

## ٤- پێغەمبەر (د.خ) لەو جولەکە و مەسیحییانەی کە لە دەرەوەبوون فێری قورئان بووە:

هەموو تۆمارە مێژووییەکان کە ئێستا لەبەردەستدان ئەوە دەردەخەن کە محەمەد تەنها سێ گەشتی کردووە بۆ دەرەوەی شاری مەککە پێش بوون بە پێغەمبەری خوا:

**یەکەم:** لە تەمەنی (٩ ساڵ)یدا لەگەڵ دایکیدا چووە بۆ مەدینە.
**دووەم:** لە نێوان تەمەنی (٩ بۆ ١٢ ساڵ)یدا لەگەڵ مامیدا (ئەبو تالیب) بە گەشتێکی بازرگانی چووە بۆ سووریا.

سێیەم: لە تەمەنی (٢٥ساڵ)یدا سەرپەرشتی کاروانەکانی خەدیجەی کردووە بۆ سووریا.
ئەوە دوورە لە خەیاڵەوە کە وادابنێیت کە قورئان لە ماوەی ئەو سێ گەشتەدا لە ئەنجامی ئەو بینین و قسەکردنانەوە دروستبووە.

## ٥- پاساوی مەنتقی بۆ سەلماندنی ئەوەی کە پێغەمبەر (د.خ) قورئان لە جولەکە و مەسیحییەکانەوە فێرنەبووە:

**یەکەم:** ژیانی ڕۆژ بە ڕۆژی پێغەمبەر (د.خ) کتێبێکی کراوەیە بۆ هەموو کەسێك کە بیبینێت، لە ڕاستیدا ئایەتێك دابەزیوە کە داوای لە خەڵکی کردووە کە تایبەتمەندی بدەن بە پێغەمبەر (د.خ) لە ماڵەکەی خۆیدا، ئەگەر پێغەمبەر خەڵکی بینیبایە کە پێیان گوتووە چی بڵێت وەکو ئایەت لە خواوە؛ ئەوا بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بە نهێنی نەدەمایەوە.

**دووەم:** دیارترین خانەدانانی قوڕەیش لە شوێنکەوتەی پێغەمبەر بوون و ئایینی ئیسلامیان قبوڵکردبوو و، کەسانی ژیر و زیرەك بوون کە زۆر بە ئاسانی تێبینی هەر شتێکی گوماناوییان دەکرد کە پێغەمبەر (د.خ) ئایەتی بۆ دەهێنان.

**سێیەم:** نەیارانی پێغەمبەر (د.خ) بە وردی چاویان خستبووەسەر پێغەمبەر (د.خ)، تاکو شتێك بدۆزنەوە و ئەوە بسەلمێنن کە بانگەشەکەی درۆیە، ئەوان نەیانتوانی تەنانەت یەك خاڵیش بەدیی بکەن.

## ٦- پێغەمبەر (د.خ) کەسێکی نەخوێندەوار بووە:

ئەو بیرۆکەیەی کە محەمەد (د.خ) قورئانی داناوە، یاخود کۆپی کردووە لە سەرچاوەی ترەوە، دەتوانرێت بە تەنها ڕاستییەکی مێژوویی ڕەت بکرێتەوە، ئەویش ئەوەی کە پێغەمبەر (د.خ) نەخوێندەواربووە. خوای گەورە لە سوورەتی (العنکبوت) ئایەتی (٤٨) گەواهی دەدات: {وَمَا كُنْتَ تَتْلُو مِنْ قَبْلِهِ مِنْ كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذًا لَارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ} (العنكبوت: ٤٨)، **واتە: (هەرگیز لە پێش ناردنی ئەم قورئانەدا تۆ هیچ کتێبێکت نەخوێندۆتەوە و بە دەستی خۆشت هیچ نامە و کتێبێکت نەنووسیوە ئەگەر خوێندەوار بویتایە ئەو دەمە ناهەق بێژەکان دەکەوتنە گومانەوە لە خۆت و لە قورئان).** خوا دەیزانی کە ڕەنگە زۆرێك گومانیان هەبێت لە ڕاستی قورئان و نووسینەکەی بداتە پاڵ پێغەمبەر ، هەربۆیە خوا لەوپەڕی دانایی خۆیەوە بوو دواهەمین پەیامبەری خۆی کەسێکی نەخوێندەواری هەڵبژارد؛ بۆ ئەوەی کەمترین پاساو نەبێت بۆ گومان بوون لە پێغەمبەرەکەی.

پێشبینیکردنی هاتنی پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار لە ئینجیلدا کراوە، لە کتێبی (ئیسایە) زنجیرەی (٢٩ بەشی ١٢) «ئەو کتێبەی کە پێشی گەیشتووە کە فێری نەبووە».

قورئان لە چوار شوێنی جیاوازدا گەواهی ئەوە دەدا کە پێغەمبەر (د.خ) نەخوێندەوار بووە؛ وەك لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی ١٥٨: {قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ يُحْيِي وَيُمِيتُ فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَكَلِمَاتِهِ وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ} (الأعراف: ١٥٨)، واتە: (ئەی پێغەمبەر بڵێ ئەی

خەڵکینە من پەیامبەر و نێردراوی خوام بۆ لای سەرجەمی ئێوە، من ئەو خوایە ناردوومی کە دەسەڵاتدارێتی تەواوی زەوی و ئاسمانەکان تەنها هی ئەوە، ئەو نەبێ هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق، ژیان ببەخشێ و گیان بستێنێ، دەسا ئێوەش بە خوا و ئەو پەیامبەرە هەواڵدەرە نەخوێندەوارەی خوا بڕوا بکەن، کە ئەوەی بۆ خۆی بڕوای کامڵی بە خوا و هەموو شتەکانی ئەو هەیە، دەبێت ئێوەش شوێنی بکەون سا بەڵکو بەختیار و شارەزای ڕێگەی هەقبن). هەروەها لە سوورەتی (الجمعة) ئایەتی (٢) خوای گەورە دەفەرموێت: {هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولًا مِنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ}، واتە: (خوا هەر ئەو پەروەردگارەیە لە ناو عەرەبە نەخوێندەوارەکاندا پەیامبەرێکی پایەبەرزی لە خۆیان نارد، دڵ و دەروون و ڕواڵەتیان پاك دەکاتەوە و قورئان و فەرموودەکانی خۆییان فێردەکات، پێش هاتنی ئەو ئەوان لە گومڕایی و سەلێشواوییەکی ئاشکرادا بوون).

## ٧- ئینجیل چاپی عەرەبی نەبووە:

چاپی عەرەبی (ئینجیل) لە سەردەمی محەمەددا (د.خ) نەبووە، کۆنترین چاپی عەرەبی (The Old Testament) زیاتر لە (٢٥٠ ساڵ) دوای کۆچی دوایی محەمەد (د.خ) لە ساڵی (٩٠٠ز) لە لایەن (سادیاس گاوون) پەیدا بوو و، کۆنترین چاپی (The New Testament) لەلایەن (ئێرپێنیەس) و لە ساڵی (١٦١٦ز) نزیکەی (هەزار ساڵ) دوای وەفاتی پێغەمبەر (د.خ) نووسراوە.

٨- هاوشێوەیی لەنێوان قورئان و ئینجیل بەهۆی سەرچاوەی گشتییەوە:
هاوشێوەیی لەنێوان قورئان و ئینجیل بە گرنگییەوە ئەو مانایە ناگەیەنێت کە ئەوەی پێشووتر کۆپی کراوەتەوە لەوەی دواتردا، لە ڕاستیدا ئەوە ئەو بەڵگەیە دەدات بە دەستەوە کە هەردوو کتێبەکە لە یەك شوێنەوە سەرچاوەیان گرتووە، هەموو سروشە ئاسمانییەکان لە هەمان سەرچاوەوە هاتوون کە ئەویش خوای گەردوونە، گرنگ نییە کە مرۆڤ گۆڕانکارییان کردووە لەو کتێبە پیرۆزە ئایینیانە کە ڕاستەقینەییان شێواندووە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك ماون کە بەدوور بن لەو شێواندنە.
ئەوە ڕاستە کە هەندێك هاوشێوەبوون و تەریبی لەنێوان قورئان و ئینجیلدا هەن، بەڵام ئەوە بەس نییە بۆ تۆمەتبارکردنی محەمەد (د.خ) بە کۆپی کردنی قورئان لە ئینجیلەوە، هاوشێوەیی لەنێوان ئەو دوو کتێبەدا خوایەکی ڕاستەقینەیە و، بەردەوامبوون لەسەر پەیامی سەرەکی کە بریتییە لە یەکتاپەرستی.

## ٩- موسوڵمان بڕوای بە تەورات و زەبور و ئینجیل و قورئان هەیە:

چوار کتێبی پیرۆزی خوا کە لە قورئاندا ئاماژەیان بۆ کراوە کە بریتین لە: تەورات و زەبور و ئینجیل و قورئان.
- تەورات ئەو کتێبە یان سروشەیە کە نێردراوە بۆ موسا پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت).
- زەبور ئەو کتێبە یان سروشەیە کە نێردراوە بۆ داوود پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت).

- ئینجیل ئەو کتێبە یان سروشەیە کە نێردراوە بۆ عیسا پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت).
- قورئان کۆتا کتێب و سروشە کە نێردراوە بۆ محەمەد پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت).

یەکێك لە بنەماکانی بڕوابوونی کەسی موسوڵمان بریتیە لەوەی کە بڕوات بە هەموو پەیامبەرەکانی خوا و هەموو کتێبە پیرۆزەکانی هەبێت، هەرچەندە کتێبە پیرۆزەکان جگە لە قورئان دەستکاریکراون و گۆڕانکارییان تێدا کراوە؛ تەنها بەشێکی کەمی وەك خۆی ماوەتەوە کە قسەی خوا بێت، ئەو ئینجیلانەی کە ئێستا لەبەردەستدان هەمان ئەو ئینجیلە نییە کە خوای گەورە بۆ عیسای ناردووەتە خوارەوە.

قورئان ئەوە دەخاتەڕوو کە هەموو پێغەمبەرەکان برا بوون، هەموویان نێردراوی هاوشێوەبوون و، هەمان پەیامی سەرەکییان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، لەبەرئەمە فێرکردنی بنچینەیی بیروباوەڕی سەرەکی نابێت بەرپەرچی یەکتری بداتەوە، هەرچەندە ئەگەر کاتی جیاواز هەبووبێت لەنێوانیاندا، لەبەرئەوەی هەموو ئەو نێردراوانە یەکێکە ئەویش خوای بە دەسەڵات و مەزن، هەربۆیە قورئان دەفەرموێت ئەو جیاوازییەی کە لەنێوان ئایینە جیاوازەکان هەیە بەرپرسیارێتی پەیامبەرەکان نییە، بەڵکو شوێنکەوتووانی ئەو پەیامبەرانە بەشێك لەوەی فێریانکراوە لەبیریانکردووە؛ زیاتر لەوەش بە هەڵە لێکدانەوە و گۆڕانکارییان لە کتێبە پیرۆزەکاندا کردووە.
ناوێکی تر بۆ قورئان (الفرقان)ە کە بە مانای ئەو بنچینانە دێت بۆ بڕیاردان

لەسەر ڕاست و هەڵە و، ئەوەش بنچینەی قورئانە کە ئێمە دەتوانین ئەوە لێکبدەینەوە چ بەشێکی کتێبی پیرۆزی پێشتر دەتوانرێت بە قسەی خوا بزانرێت.

## ١٠- بەراوردی زانستییانە لەنێوان قورئان و ئینجیلدا:

ئەگەر چاوێك بە قورئان و ئینجیلدا بخشێنین ڕەنگە چەندین خاڵ بدۆزینەوە کە لە هەردوو کتێبەکەدا وەك یەك بن، بەڵام کاتێك بە وردی شییاندەکەینەوە ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە وەکو جیاوازی نێوان (تەباشیر و پەنیر) وایە، کارێکی قورسە بۆ کەسێك بڕیارێکی ڕەها بدات لەسەر ئەوەی کە کامەیان ڕاستە، ئایینی ئیسلام یاخود ئایینی مەسیحی؟ ئەگەر بێت و پەیامەکانی هەردوو ئایینە پیرۆزەکە بخەینە بەرامبەر زانست ئەوا خۆت ڕاستییەکەت بۆ دەردەکەوێت.

### یەکەم: دروستکردنی گەردوون لە (شەش ڕۆژ)دا:

بە پێی ئینجیل لە کتێبی یەکەم (جێنسس-دروستبوون) لە بەشی یەکەمدا هاتووە کە گەردوون لە ماوەی (شەش ڕۆژ)دا دروستکراوە و، هەموو ڕۆژێکیش بە (٢٤ کاتژمێر) دانراوە، قورئانیش ئاماژە بەوە دەکات کە گەردوون لە ماوەی شەش (الأيام)دا دروستکراوە، (الأيام) شێوەی کۆی ساڵە، ئەم وشەیە دوو مانای هەیە: یەکەمیان بە مانای (٢٤ کاتژمێر)ی ئاسایی دێت، دووەمیان بە مانای قۆناغ، ماوە یان چەرخێك دێت کە ماوەیەکی زۆر درێژە، کاتێك قورئان ئاماژە بەوە دەکات کە گەردوون لە ماوەی شەش (الأيام)دا دروستکراوە؛ ئاماژەیە بۆ دروستکردنی زەوی و ئاسمان لە ماوەی

شەش چەرخ یان ماوەدا، زانست هیچ ڕەخنەیەکی لەم دەستەواژەیە نییە، دروستکردنی زەوی (بلیۆنان ساڵ)ی خایاندووە، کە ئەمەش ئەو هەڵەیەی (ئینجیل) دەسەلمێنێت کە دەڵێت: «گەردوون لە ماوەی شەش ڕۆژی ٢٤ کاتژمێریدا دروستکراوە».

## دووەم: خۆر دوای ڕۆژ دروستکراوە:

لە ئینجیلدا لە کتێبی (جێنسس) لەبەشی (٣-٥)دا هاتووە دیاردەی شەو و ڕۆژ لەیەکەم ڕۆژی دروستکردندا لەلایەن خواوە دروستبووە، سووڕی ڕووناکی لە گەردووندا لە ئەنجامی کاردانەوەی ئاڵۆزی ئەستێرەکانەوەیە، ئەو ئەستێرانە بە گوێرەی ئینجیل لە (چـوارەم ڕۆژ)ی دروستکردندا دروستبوون، ئەوە زۆر نا لۆژیکییە کە ئاماژە بۆ دیاردەی ڕۆژ و شەو بکەیت لە یەکەم ڕۆژدا دروستکراوە و، سەرچاوەکەشی ئەستێرەیەکە سێ ڕۆژ دوای ئەو دروستبووە، سەرباری ئەوەش هەبوونی ئێوارە و بەیانی وەك ئامرازێك بۆ تاکە ڕۆژێك تەنها تێگەیشتنە دوای دروستبوونی زەوی و سووڕانەوەی بە دەوری خۆردا، لەبەرامبەردا لەگەڵ ناوەڕۆکی (ئینجیل) سەبارەت بەم مەسەلەیە قورئان هیچ بەدوایەکداهاتنێکی نازانستی دروستبوونی گەردوون باس ناکات.

## سێیەم: دروستبوونی خۆر، زەوی، مانگ:

بە گوێرەی (ئینجیل) لە کتێبی (جێنسس) بەشی (٩-١٣)دا هاتووە زەوی لە (ڕۆژی سێیەم)دا دروستکراوە و، بە گوێرەی بەشی (١٤-١٩)ی هەمان کتێب خۆر و مانگ لە (چوارەم ڕۆژ)دا دروستبووە، کەواتە مانای دروستبوونی

خۆر و مانگ دوای دروستبوونی زەوی دژیەکن سەبارەت بە بیرۆکەی پێکهاتنی کۆمەڵەی خۆر.

## چوارەم: ژیانی ڕووەکەکان لە ڕۆژی سێیەم و خۆر لە چوارەم ڕۆژدا دروستکراوە:

بە گوێرەی ئینجیل لە کتێبی (جێنسس) بەشی (١١-١٣) ژیانی ڕووەکەکان و تۆو و درەخت و دارەکان لە (ڕۆژی سێیەم)دا دروستبووە بە گوێرەی هەمان کتێبی سەرەوە بەشی (١٥-١٩) خۆر لە (ڕۆژی چوارەم) دروستبووە، لە ڕووی زانستەوە چۆن دەبێت ژیانی ڕووەکەکان دروست ببێت بەبێ هەبوونی خۆر؟ ئەگەر محەمەدی پێغەمبەر (د.خ) دانەری قورئان بووایە و، ناوەڕۆکی قورئانی لە ئینجیلەوە وەرگرتووە؛ کەواتە چۆن خۆی دەپاراست لەو هەڵانەی کە لەئینجیلدا هەن؟ لە قورئاندا هیچ دەستەواژەیەکی هەڵە نییە، هیچ زانیاریەك نییە کە لەگەڵ ڕاستی زانستیدا ناکۆك بێت.

## پێنجەم: خۆر و مانگ ڕووناکییان لێوەدەردەچێت:

بە گوێرەی (ئینجیل) خۆر و مانگ ڕووناکی خۆیان هەیە لە کتێبی (جێنسس) زنجیرەی (١ بەشی ١٦) دەڵێت: خوا دوو ڕووناکی گەورەی دروستکردووە، ڕووناکییە گەورەکەیان بۆ بەڕێوەبردنی ڕۆژ و، ڕووناکییە بچوکەکەیان بۆ بەڕێوەبردنی شەو، زانست ئەوەمان پێدەڵێت کە مانگ هیچ ڕووناکییەکی نییە و، ڕووناکی لێوەی دەرناچێت، ئەمە ئەو ڕاستییەی قورئان پشت ڕاست دەکاتەوە کە مانگ پەرچە ڕووناکی دەداتەوە، بۆ بیرکردنەوە لەوە (١٤٠٠

ساڵ) لەمەوبەر پێغەمبەر (د.خ) ئەو هەڵە زانستییەی ڕاستکردووەتەوە.

## ١١- ئادەم یەکەم پیاوی سەر زەوییە کە (٥٨٠٠ ساڵ) پێش ئیستا ژیاوە:

بە پێی زانستی جینۆلۆجی مەسیح پێغەمبەر کە لە ئینجیلدا هاتووە: ئادەم یەکەم پیاو بووە لەسەر زەوی پێش نزیکەی (٥٨٠٠ ساڵ) ژیاوە.

یەکەم: ماوەی نێوان ئادەم و ئیبراهیم (١٩٤٨ ساڵ) بووە.

دووەم: ماوەی نێوان ئیبراهیم و مەسیح نزیکەی (١٨٠٠ ساڵ) بووە.

سێیەم: (٢٠٠٠ ساڵ) لە مەسیح ەوە بۆ ئەمڕۆ

ئەمە زیاتر ڕوونتر دەبێتەوە بە گوێرەی ڕاستییەکی ڕۆژنامەیەکی جولەکە کە ئێستا نزیکەی ساڵی (٥٨٠٠)ە.

بەڵگەی تەواو لەبەردەستدایە لە ڕووی سەرچاوەی شوێنەوارناسی و مرۆڤناسییەوە ئەوە دەردەخات کە یەکەم مرۆڤ کە لە سەر زەوی بووە (دەیان هەزار ساڵ)ە نەك (٥٨٠٠ ساڵ) لەمەو پێش کە لە ئینجیلدا هاتووە، هەروەها قورئانیش سەبارەت بە ئادەم قسە دەکات وەك یەکەم کەس لەسەر ڕووی زەوی، بەڵام هیچ کات و ماوەیەکی لەسەر ژیانی نەخستووەتەڕوو وەك ئەوەی کە لە ئینجیلدا هاتووە، ئەوەی کە لە ئینجیلدا هاتووە بە تەواوی لەگەڵ زانستدا یەك ناگرێتەوە.

## ١٢- نوح و لافاوەکە:

بە گوێرەی ئەو وەسفەی کە لە ئینجیلدا لەمەڕ لافاوەکە کراوە لە کتێبی (جێنسس) بەشی (٦-٧-٨)دا ئەوە دەردەخات کە نەخۆشییەك

بڵاوبووەتەوە هەموو زیندەوەرێکی لەسەر زەوی لەناوبرد؛ جگە لەوانەی کە لە کەشتیەکەی نوحدا بوون، ئاماژە بەوەش دەکات کە ئەو ڕووداوە (١٦٥٦ ساڵ)ی خایاندووە دوای دروستبوونی ئادەم، یاخود (٢٩٢ ساڵ) پێش لەدایکبوونی ئیبراهیم؛ لەو کاتەی کە نوح تەمەنی (٦٠٠ ساڵ) بووە و، لافاوەکە لە ساڵی (٢١ یاخود ٢٢)یەمین ساڵ بوو پێش زایین.

چیرۆکی ئەو لافاوە بەو شێوەیەی کە لە ئینجیلدا هەبووە، بەرپەرچی ئەو بەڵگە شوێنەوارناسییە دەداتەوە کە دەسەڵاتی یانزەهەم لە میسر و سێیەم دەسەڵات لە بابیلۆن هەبوون بە بێ هیچ لە ناوچوونێك لە شارستانی و، بە تەواوی کاریگەری نەکەوتووەتەسەر لە ساڵی (٢١ و ٢٢)هەمینی پێش زایینەوە ڕوویداوە. ئەمە بەرپەرچی ئەم چیرۆکەی ئینجیل دەداتەوە کە دەڵێت هەموو جیهان لە ئاودا نقووم بووە، لەبەرامبەردا چیرۆکی نوح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) و، لافاوەکە بەرپەرچی زانستی ناداتەوە چونکە؛ یەکەم: قورئان هیچ کات و ساتێکی ڕووداوەکەی باس نەکردووە، دووەم: بە گوێرەی قورئان لافاو دیاردەیەکی گەردوونییە کە تەواوی ژیانی لەسەر زەوی لەناوبردووە، لە ڕاستیدا قورئان بە تایبەت ئاماژەی بەوە کردووە کە لافاوەکە ڕووداوێکی ناوچەیی بووە و، تەنها خەڵکی نوحی گرتووەتەوە، ئەوە نا عەقڵانییە کە وا دابنێیت کە محەمەد (د.خ) چیرۆکی لافاوەکەی لە ئینجیلەوە وەرگرتبێت و، هەموو هەڵەکانیشی ڕاستکردبێتەوە پێش ئەوەی لە قورئاندا ئاماژەی پێکردبێت.

## ١٣- موسا پێغەمبەر و فیرعەون:

چیرۆکی موسا پێغەمبەر و فیرعەون زۆر لە قورئان و ئینجیلدا باسکراوە،

هەردوو کتێبە پیرۆزەکە هاوڕان لەسەر ئەوەی کە فیرعەون لەناو ئاودا نقوم بووە؛ کاتێك هەوڵی ئەوەی داوە گەمارۆی موسا پێغەمبەر و هاوەڵانی بدات کە بە ئاوێکی بەریندا دەپەڕینەوە، قورئان زانیاری زیاتر دەخاتەڕوو لە سوورەتی (یونس) ئایەتی (٩٢): {فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ آيَةً وَإِنَّ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ عَنْ آيَاتِنَا لَغَافِلُونَ} (یونس: ٩٢)، واتە: (جاوا ئەمڕۆ لاشەت لە تیاچوون ڕزگار دەکەین و ناهێڵین لەناو دەریادا تیابچێت، تا بۆ ئەوانەی تۆ ببێتە پەند و ئامۆژگاری، چونکە بێگومان زۆربەی خەڵکی لە نیشانەکانی ئێمە بێ ئاگا و خافڵن).

دکتۆر (مۆریس بۆکایل) دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر ئەوەی سەلماندووە هەرچەندە ڕامسیسی دووەم کە زانرا کە گەمارۆی بەنی ئیسرائیلییەکانی داوە؛ بەو پێیەی کە لە ئینجیلدا هاتووە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو مردووە کاتێك موسا پێغەمبەر خەڵکەکانی دەپەڕاندەوە، کوڕی ڕامسیسی دووەم کە ناوی (هێنری پتاه)ە کە سەرکەوتووی کردووە لەوکاتەی کە فیرعەون لە ئاوەکەدا نقوم بووە لەکاتی کۆچ کردنەکەدا، لە ساڵی(١٨٩٨) جەستەی مۆمیاکراوی (هێنری پتاه) لە دۆڵی پاشاکان لە میسر دۆزرایەوە، لە ساڵی (١٩٧٥ز) دکتۆر (مۆریس بۆکایل) لەگەڵ دکتۆرەکانی تردا مۆڵەتی شیکاریکردنی جەستەی (هێنری پتاه)یان وەرگرت، ئەوەی دۆزرایەوە ئەوەی سەلماند کە (هێنری پتاه) بەهۆی نقووم بوونی لە ئاودا، یان لە ئەنجامی ترسێکی لە ناکاوەوە مردبێت لە ئەنجامی نقوم بوونەکەدا، هەرچەندە ئایەتە قورئانییەکە کە دەفەرموێت ئێمە جەستەی دەپارێزین وەك هێمایەك، ئێستا جەستەی فیرعەون لە ژووری پاشا مۆمیاکراوەکان پارێزراوە لە مۆزەخانەی میسر لە شاری قاهیرە، ئەو ئایەتەی قورئان وای لە دکتۆر (مۆریس بۆکایل) کرد کە

لێکۆڵینەوە سەبارەت بە قورئان بکات کە خۆی کەسێکی مەسیحی بوو، دواتر کتێبێکی نووسی بە ناوی (ئینجیل و قورئان و زانست) و دڵنیابوو لەوەی کە دانەری قورئان هیچ کەسێك نییە جگە لە خوا خۆی، دواتر موسوڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند.

## ١٤- قورئان کتێبێکە لە خواوە:

ئەو بەڵگانە بەسن بۆ گەیشتن بەو ئەنجامەی کە قورئان لە ئینجیلەوە کۆپی نەکراوە، بەڵام قورئان بریتییە لە (الفرقان) بۆ بڕیاردان لەسەر ڕاست و هەڵە، بەوەی چ بەشێك لە ئینجیل بە قسەی خوا دادەنرێت، قورئان خۆی گەواهی دەدات لە سوورەتی (السجدة) ئایەتی (٢-٣): {تَنْزِيلُ الْكِتَابِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ (٢) أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ بَلْ هُوَ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكَ لِتُنْذِرَ قَوْمًا مَا أَتَاهُمْ مِنْ نَذِيرٍ مِنْ قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ (٣)} (السجده: ٢-٣)، واتە: (هیچ گومانی تێدانییە کە لەلایەن پەروەردگاری جیهانەوە بە بەش بەش دابەزێندراوەتە خوارەوە، یا کافر و خوانەناسەکان دەڵێن: موحەمەد خۆی هەڵیبەستووە، بۆیان نییە ئەوە بڵێن، بەڵکو ئەو هەقەیە لەلایەن پەروەردگارتەوە ڕەوانە کراوە هەتا تۆ ئەو قەومە بترسێنی کە پێش تۆ هیچ بێدارکەرەوەیەکیان بۆ نەهاتووە).

# پرسیاری چل و هەشتەم

## جیاوازی لە نێوان ماری و مریەم

**لە قورئانەکەی ئێوەدا ئاماژە بەوە کراوە کە ماری خوشکی هاروونە، کێ قورئانی نوسیوە و جیاوازی نەکردووە لە نێوان مریەم کە خوشکی هاروونە، ماریش دایکی عیسا پێغەمبەرە کە ماوەی کاتی نێوانیان نزیکەی (هەزار ساڵ) دەبێت.**

## وەڵام/

**١- لە زمانی سامیدا خوشك بە مانای ڕەگەز یان نەوە دێت:**

خوای گەورە لە سوورەتی (مریم) ئایەتی (٢٧-٢٨)دا دەفەرموێت: {فَأَتَتْ بِهِ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُ قَالُوا يَا مَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْئًا فَرِيًّا (٢٧) يَا أُخْتَ هَارُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ امْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا (٢٨)} (مريم: ٢٧-٢٨)، واتە: (ئینجا مریەم ملی راکێشا بۆ فەرمانی خوا و هاتەوە بۆ لای خزم و کەس و کار و دۆستانی و منداڵێکش بە باوەشیەوە بوو، ئەوەیان کە دیت هەموویان بە سەرسوڕمانەوە وتیان: مریەم بەڕاستی کارێکی سەیر و سەمەرەی ئابڕوبەرانەت ئەنجامداوە، ئەی خوشکی هارون خۆ تۆ نە باوکت پیاوێکی خراپەکار بوو و نەدایکیشت بەدکار و داوێن پیس بوو ئەی ئیتر ئەم منداڵەت لە کوێوە هێنا؟).

کریستیانەکان دەڵێن کە محەمەد پێغەمبەر (د.خ) جیاوازی نێوان ماری، دایکی عیسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) و، مریەمی خوشکی پێغەمبەر هاروونی نەزانیوە لە کاتێکدا ماوەی نێوانیان نزیکەی (هەزار ساڵ) دەبێت، لە پێکهاتەی زمانی عەرەبیدا خوشك بە مانای (نەوە)ش دێت، کاتێك خەڵکی دەڵێن «اخت هارون» یان بە مانایەکی تر «خوشکی هاروون» ئەوا بە ڕاستی بە مانای نەوەی هارون پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) دێت.

## ٢- کوڕ بە مانای (نەوە)ش دێت:

لە (The Gospel of Mathew)دا زنجیرەی یەکەم لە بەشی یەکەمدا هاتووە « پێغەمبەر مەسیح کوڕی داود» هەروەها لە (The Gospel of Luck) زنجیرەی سێیەم بەشی بیست و سێیەمدا هاتووە «مەسیح کە تەمەنی نزیکەی ٣٠ ساڵ دەبوو، بوو بە کوڕی یوسف» .
ئایا مەسیح پێغەمبەر دوو باوکی هەیە؟ چی بە کەسێك دەڵێن کە دوو باوکی هەبێت؟ شیکردنەوە بۆ ئەم دەستەواژەیەی کە مەسیح کوڕی داوود بووە، ئەوە کە مەسیح نەوەی داوود بووە «کوڕ» لێرەدا بە مانای «نەوە» دێت.

# پرسیاری چل و نۆیەم

## مەسیح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) نەمردووە

**ئایا ئەوە ڕاستە کە لە سوورەتی (مریەم ئایەتی٣٣) دا ئاماژە بەوە کراوە کە مەسیح پێغەمبەر مردووە و زیندووکراوەتەوە؟**

## وەڵام/

**مەسیح دەڵێت:** «ئەو ڕۆژەی کە دەمرم» نەك ئەو ڕۆژەی کە مردم» لە سوورەتی (مریەم ئایەتی٣٣)دا خوای گەورە دەفەرموێت: {وَالسَّلَامُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدْتُ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا} (مريم: ٣٣). واتە: (سڵاو و دروودی خوام لەسەر بێ لە ڕۆژێك لەدایكبووم و ڕۆژێك کە ئەمرم و ڕۆژێکیش کە زیندوودەبمەوە). مەسیح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) بە زیندوویی بەرەو ئاسمان بەرزکرایەوە، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا و لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (١٥٧-١٥٨)دا دەفەرموێت: {وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَكِنْ شُبِّهَ لَهُمْ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِنْهُ مَا لَهُمْ بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا اتِّبَاعَ الظَّنِّ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا (١٥٧) بَلْ رَفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا (١٥٨)} (النسا :١٥٧-١٥٨)، واتە: (وە لەبەر ئەوەش کە دەیانگوت: ئێمە عیسای کوڕی مریەمان کوش کە پێغەمبەری خودایە، خوای گەورە بە درۆیان دەخاتەوە و دەفەرموێت:

نه توانیتان بیکوژن و نه توانیشتان له قه‌ناره‌ی بده‌ن، وه‌کو خۆیان کردیانه هه‌را، به‌ڵکو سه‌ریان لێ تێکچوو بوو، پیاوێکیان دیت له شکل و بیچمدا وایان زانی (عیسا)یه و له قه‌ناره‌یان دا، وه ئه‌وانه‌ی ده‌رباری ئه‌وه کێشه‌یانه و له دوودڵیدان هیچ زانستێکیان به‌وه نییه جگه له شوێنکه‌وتنی گومان نه‌بێ بۆیه ده‌فه‌رموێت: به یه‌قین و بێگومان نه‌یانکوشتووه به‌ڵکو خوای گه‌وره به‌ره‌و خۆی به‌رزیکردۆته‌وه، خواش هه‌میشه به ده‌سه‌ڵات و کارزانه).

# پرسیاری پەنجایەم

## (مەسیح) وشەیەکە لە خوا و «روح»ی خوایە.

**ئایا ئەوە قورئانەکەی ئێوە نییە کە ئاماژە بەوە دەکات کە مەسیح (كلمة الله) واتە (وشەی خوایە)، هەروەها وەکو (ڕوحی خوا)؟**

**وەڵام/**

### ١- مەسیح وشەیەکە لە خواوە نەك لە خوا.

قورئانی پیرۆز لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (٤٥)دا دەفەرموێت: {إِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِنْهُ اسْمُهُ الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَمِنَ الْمُقَرَّبِينَ} (ئێل عیمران: ٤٥)، واتە: (لەوێ نەبوویت کە مەلائیکە (جبریل) بە مریەمیان وت: بەڕاستی خوا موژدەی کارێکی سەمەرەت پێدەدات کورێکت ئەداتێ بێ باوك و هۆ و هۆکارەکانی منداڵبوون بەڵکو تەنها بە فەرمانی ببە، ناوی عیسای کوڕی مریەمە و نازناوی مەسیحە، لە دونیا و قیامەتدا پیاوماقوڵ و بەڕێزە، وە یەکێکە لە نزیکەکانی خوا). مەسیح لە قورئاندا ئاماژەی بۆ کراوە بە «وشەیەك لە خواوە» نەك «وشەیەك لە خوا» ئەوە بە مانای ئەوە دێت کە پەیامبەری خوایە.

٢- ناونیشانی پێغەمبەر بە مانای ئەوە نایەت کە بەتایبەتی بۆ ئەو پێغەمبەرە ناونیشانی جیاواز دراوە بە پێغەمبەرە جیاوازەکان.
هەرکاتێك کە ناونیشانێك دراوە بە پێغەمبەرێك ئەوا بە مانای ئەوە نایەت کە پێغەمبەرەکانی تر هەمان کەسایەتی و چەندێتییان نییە، بۆ نموونە ئیبراهیم پێغەمبەر کە ئاماژەی بۆ کراوە لە قورئاندا وەکو (**خليل الله**) یان هاوڕێی خوا، ئەمە بە مانای ئەوە نایەت کە پێغەمبەرەکانی تر هاوڕێی خوا نەبوون، موسا پێغەمبەر بە (**كلمة الله**) ئاماژەی بۆ کراوە بە مانای ئەوەی کە خوا قسەی لەگەڵ کردووە؛ ئەوە بە مانای ئەوە نایەت کە خوا لەگەڵ پێغەمبەرەکانی تر قسەی نەکردووە.
هاوشێوەی ئەوە کاتێك مەسیح پێغەمبەر لە قورئاندا بە (**كلمة الله**) ئاماژەی بۆ کراوە کە بە مانای «وشەیەك لە خواوە» بە مانای ئەوە نایەت کە پێغەمبەرکانی تر وشەی خوا نەبوون.

### ٣-پێغەمبەر (یەحیا)یش بە (كلمه الله) ناوهێنراوە:

لە قورئاندا یەحیا پێغەمبەریش بە (**كلمة الله**) ناوی هاتووە لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (٣٩): {فَنَادَتْهُ الْمَلَائِكَةُ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي فِي الْمِحْرَابِ أَنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَى مُصَدِّقًا بِكَلِمَةٍ مِنَ اللَّهِ وَسَيِّدًا وَحَصُورًا وَنَبِيًّا مِنَ الصَّالِحِينَ} (آل عمران: ٣٩)، واتە: (ئینجا فریشتەکەی ئێمە (جوبرەئیل) بانگی لێکرد، کە ئەو کات لە میحرابدا وەستابوو و نوێژی ئەکرد، بانگێکی لێکرد کە بە ڕاستی خوای گەورە موژدەت پێدەدا بە یەحیا کە ددان بە گشت بێژە و وشەیەکی خودادا دەنێ مرۆڤێکی مەزن و گەورە و ڕێزدارە لە ناو گەلەکەیدا).

## ٤-مەسیح بە «روح الله» ناو هێنراوە:

مەسیح هەرگیز بە **«روح الله»** ناوی نەهاتووە بەڵکو بە «روحێك لە خواوە» ناوی هاتووە لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (١٧١): {يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لَا تَغْلُوا فِي دِينِكُمْ وَلَا تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ إِلَّا الْحَقَّ إِنَّمَا الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ اللَّهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَلَا تَقُولُوا ثَلَاثَةٌ انْتَهُوا خَيْرًا لَكُمْ إِنَّمَا اللَّهُ إِلَهٌ وَاحِدٌ سُبْحَانَهُ أَنْ يَكُونَ لَهُ وَلَدٌ لَهُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَكَفَى بِاللَّهِ وَكِيلًا} (النساء: ١٧١)، واتە: (ئەی خەڵکی خاوەننامە هەڵە ڕۆیی و زێدە ڕۆیی لە دینەکەتاندا مەکەن شتێ ڕاست نەبێ ئێوە دەربارەی خوا مەیڵێن، مەسیح کوڕی مریەم هەر پێغەمبەری خوا بووە خوای بە توانا وشەی خۆی هاوێشتە ناو پزدانی مریەم و گیانێکیشە لە خواوە، دەسا ئێوە باوەڕ بە خوا و پێغەمبەرانی بهێنن مەڵێن سێ خوا هەیە واتە مەسیح و دایکی مەکەنە هاوبەشی خوا، کۆتایی بەو قسانە بێنن بۆ ئێوە باشترە، بێ شك هەر (**الله**) تاکە خوایە، پاك و بێخەوشە لەو تۆمەتە کە منداڵی هەبێ، هەرچی لەناو ئاسمانەکان و زەوییدا هەیە هەر هی ئەوە و خواش هەرخۆی بەسە بۆ پێکهێنانی کاروبار و بەڕێوەبردنی بوونەوەر و هیچ پێویستیەکی بە عیسا و خەڵکی تر نییە).

## ٥- ڕوحی خوا لە هەموو مرۆڤایەتیدا هەناسە دەدات:

ڕوحێك لە خواوە بە مانای ئەوە نایەت کە مەسیح خوایە، قورئان لە چەند شوێنێکدا ئاماژە بەوە دەکات کە لە سوورەتی (الحجر) ئایەتی (٢٩): {فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ} (الحجر: ٢٩)، واتە:

(ئینجا هەر کە بەتەواوی ڕێکمخست، و لە گیانی خۆم ڕوحم بەبەرداکرد و بوو بە مرۆڤێکی تەواو و خاوەن گیان ئێوەش (فریشتەکان) داوەرنەوە و دەمە و ڕوو سوژدەی بۆ بەرن هەمووتان).

# پرسیاری پەنجاو یەکەم

## ئایا قورئان لەلایەن شەیتانەوە نوسراوە؟

### قورئان قسەی خوا نییە لەبەرامبەردا کاری شەیتانە.

### وەڵام/

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم جۆرە بانگەشانەی بت پەرستەکانی مەککە کە محەمەد پێغەمبەر (د.خ) سروشەکانی لە شەیتانەوە پێگەیشتووە، خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: {إِنَّهُ لَقُرْآنٌ كَرِيمٌ (٧٧) فِي كِتَابٍ مَكْنُونٍ (٧٨) لَا يَمَسُّهُ إِلَّا الْمُطَهَّرُونَ (٧٩) تَنْزِيلٌ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ} (الواقعة: ٧٧-٨٠)، واتە: (ئەوی وەحیت بۆ کراوە قورئانێکی بە فەڕە، لە نامەیەکی پارێزراودایە، کەس دەستی لێنادات فریشتەکان نەبێت، لەلایەن پەروەردگاری جیهانەکانەوە دابەزێندراوەتە خوارەوە).

زۆر خەڵك بە هەڵە لە شەیتان تێگەیشتوون، ئەوان وا هەست دەکەن کە شەیتان دەتوانێت هەموو شتێك بکات جگە لە دوو شت کە خوا دەتوانێت بیانکات، بە گوێرەی ئەوان شەیتان لە ڕووی دەسەڵاتەوە لە خوا دەسەڵاتی کەمترە، ئەو خەڵکانە نایانەوێت ئەوە قبوڵ بکەن کە قورئان سروشێکی معجیزەییە ئەوان دەڵێن کە کاری شەیتانە.

١- ئەگەر شەیتان قورئانی بنوسیایەتەوە ئەوا لە قورئاندا ئاماژەی پێ

نەدەکرا لە سوورەتی (النحل) ئایەتی (٩٨): {فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ} (النحل: ٩٨)، واتە: (هەر کە ویستت قورئان بخوێنی بەرلەوە **(اعوذ بالله من الشیطان الرجیم)** بکە.

٢- چەندین ئایەت هەن لە قورئاندا کە بەڵگەی تەواو دەخەنەڕوو کە شەیتان نووسەر و دانەری قورئان نییە، وەکو لە سوورەتی (الأعراف) دا خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِمَّا يَنْزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ) (الأعراف: ٢٠٠)، واتە: (هەر کاتێك لە شەیتانەوە وەسوەسەیەکت بە دڵدا هات و هەڵی نایت بۆ کردنی کاری ناشەرعی و حەرام، تۆش پەنا هەر بۆ ئەو خوایە بەرەو خۆت بدە لای ئەو، چونکە ئەو زۆر ژنەوا و زانایە بەگوتار و ڕەفتاری مرۆڤ).

٣- لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (١٦٨): {يَا أَيُّهَا النَّاسُ كُلُوا مِمَّا فِي الْأَرْضِ حَلَالًا طَيِّبًا وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ} (البقره: ١٦٨)، واتە: (ئەی خەڵکینە لە رزق و ڕۆزی سەرزەمین حەڵاڵێکی پاك بخۆن، هەرگیز بە شوێن هەنگاوەکانی شەیتاندا مەڕۆن و پەیڕەوی مەکەن چونکە ئەو دوژمنێکی ئاشکراتانە).

٤- لە سوورەتی (یس) ئایەتی (٦٠): {أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَنْ لَا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ} (یس: ٦٠)، واتە: (ئەی نەوەکانی ئادەم ئاخر من پێشتر وەسیەتم بۆ نەکردن کە شەیتان نەپەرستن چونکە ئەو بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە).

شەیتان زیرەکە، گومانی تێدا نییە کە دەتوانێت ئەو بیرۆکەیە بخاتە مێشکی خەڵکەوە کە خۆی قورئانی نووسیوەتەوە، بەبەراورد بە خوای بە دەسەڵات شەیتان زۆر کاریگەر نییە، خوا زۆر زیاتر لەو بە دەسەڵاتترە، ئەو مەبەستە خراپەکانی شەیتان دەزانێت و، گومانی تێدا نییە لە قورئاندا لە چەندین شوێندا سەلماندویەتی کە قورئان قسەی خوایە نەك قسەی شەیتان.

# گرنگترین تەوەری پرسیارو وەڵامەکان

دانەری قورئان شارەزایی زانستی بیرکاری نییە

محەمەد قورئانی لە ئینجیلەوە کۆپی کردووە

ئیسلام توندوتیژی بەرهەم دەهێنێت

قورئان لەلایەن شەیتانەوە نوسراوە

موسوڵمانەکان کەعبە دەپەرستن

موسوڵمانەکان تیرۆریستن

حیجاب بۆ پیاوان

فرە پیاوی و ژنی لە ئیسلامدا

خواردنەوە کحولییەکان حەڵاڵە

هاوڕەگەزبازی

خودا تۆڵەسێنە

ئیبلیس مرۆڤ بووە

حەزرەتی عیسا مردووە

گۆشتی بەراز حەڵاڵە

پیاو لە سپێرم درووست بووە

زەوی تەختە

یەک ڕۆژ لە دیدی خوادا

مردوو بسوتێنرێت

خودا لە کتێبە پیرۆزەکانی تردا ناوی نەهاتووە

ئاسمان و زەوی لە شەش ڕۆژدا دروستکراون



وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە
مامۆستا دیار ئەسعەد

**Dr Zakir Naik**